پێشکەشە بەو دوومرۆڤەی کە لەزەمەنێک

وەک زەمەنی نوسینی ئەم رۆمانەوە حوزەیران

بوو ، بۆ دواجار بەجێیان هێشتم ..، هەردوو

خۆشەویست ، دایک و باوکم..

ئیدی هەستم کرد ون ئەبم ، لەسەر کورسییە سپییە پلاستیکییەکە ، دانیشتبووم .. ، ژنەکەم چوو کچەکەمان بخەوێنیٚ ..، تا ئەو ساتە لە بیرم بوو ، کەخەریکی خوێندنەوە بووم .. چیرۆکی پایزێکی درەنگ وەختم ئەخوێندەوە .. پایزێك کە خەریك بوو .. خۆی ئەکوشت ..، دارە رووتاوەکانی خۆی ئەبڕینەوە .. پەلکە زەردەکانی گڕ ئەدان .. تۆز و غوبارێکی سەیری هەڵئەکرد و بەڕووی باخچەکانی دائەدا .. پایزێکی توڕە بوو ..، گلەیی لە وەرزەکانی دیکە ئەکرد ..، بەهار مەکربازێکی بیٚ حەیایە .. گوایە شەرمنە ..، بەڵام ئەو دەستە خوشکی هەموو مەلە سۆزانی و پەپولە بێناموسەکانە .. ئەو لەناو گەلاٚ و سەوزایی و لەبەر هاژە و خوڕەی ئەو ئاوانەدا .. سەدان ناپاکیی ئەنجام ئەدات ، بەهار .. پیسە ..، چونکە هەموو دەم و ساتەکان فریو ئەدات ، ئەو بەعیشوە و نازە کوشندەکانی .. زەمەن ئەکوژێت .. جیٚ نەخوش ئەکات ..، بەهار لەو ساتانەی خۆی بە جوانترین پەلك و گوڵاڵە و ئاواز و تەڕایی و ناز و شۆخییەوە نیشان ئەدات ..، ئا لەو ساتەدا .. ئەو خیانەتەکانی خۆی لە دەستە خوشکەکانی ئەکات .. لەو ساتەدا بیٚ وەفاترین تۆ ئەکاتە بێستانەکان.. ژەهراویترین ئاواز بە گوێی باڵندەکاندا ئەدا.. لەو ساتانەی بەهار هەموو شتێك .. دار و بار و ئاو رووبار و گیا و گوڵاڵوك و کوریکە و مەل و شالوور و باڵندەکانی دیکە و زیندەوەرە بچوك و گەورەکان شەیدای خۆی ئەکات .. ئەو..، لەو کاتەدا درۆزنترین وەرزە .. کوشتەترین وەرزە .. تەنانەت لەو ساتانەدا .. جوانترین تاوان و گەورەترین بەدنمەکییەکانی خۆی نمایش ئەکات .. لەو عومرە کورتەی خۆیدا ..

درێژترین خەفەت .. دوورترین قەهر و مەزنترین کول و ژان ئەگەیەنێتە رەگی ئەم دارانەوە .. هەموو دارەکان .. شاتان و گەراز و توو هەنجیر و بەهیّ و شەنگەبی و....... ئیدی ئەو سەر لەو خەلیاقەتەکان ئەشێوێنیت .. گوڵە جیرانەکان لە یەکدی توڕە ئەکات .. تولەڕێیەکان و لاولاوەکان ئەکاتە دوو دۆستی هەمیشە لە یەکدی زیز ، هاژەی رووبار و ئاوازی شالوورەکان هەمیشە تێکەڵی یەك ناکات و پەرژینێك لە خوڕە .. رقێك لە دەنگ ، ئەخاتە نێوانیانەوە .. ئەو هەمیشە شەیدای توڕەبوونی کوکوختییەکانە لە تفتیلکەکان ، بەردەوام مەراقی سەرخۆشکردنی پاسارییەکانە تا ئێواران نەچنەوە سەر لانەکانیان و چیچەلۆکەکانیان بە برسییەتی بخەون .. ئەو هەمیشە سۆراخی بەیارەکان لە با ئەشارێتەوە و بەدزییەوە لە نێوان هەرمیّ و سێوەکاندا دەیان درۆ و بوختان ئەچنیّ.. ئەبوایە ئەو رەنگی رەش بوایە .. رەش وەك شەوی ناو پەلکەکانی خۆی .. رەش وەك ئەو پشیلە رەشانەی لە جنۆکەکان ئەچن.

ورده ورده بیرم ئەچۆوە ..، پایز چ توهمەیەکی دیکە ئەداتە بەهار .. بیرم ئەچۆوە .. بەڕاستییەتی یان گاڵتە ئەکات .. سوورە لەسەر ئەوەی خۆی بکوژێت یان تەنیا ئەیەوێت باخچە رووتەکان بترسێنێت و گەفێك لە زەمەنی خۆی بکات و شوێنەکان بخاتە مەترسییەکەوە ..،

خەریك بوو پرسیارێك بکەم ، بەڵام بیرم چوو .. چبوو ..؟ پرسیارەکەم لە پایز بوو .. یان لە بەهار .. لەپڕ وەك بروسکەیەك گووتم .. ژنەکەم لە بەهاردا چوو کچەکەم بخەوێنیّ یان پایز بوو ..، ترسام بەهار بێت و غەدری لێبکات و پایزیش بێت بیسوتێنیّ .. هەندیّ دەنگ .. بە یەکجار بیّ پێشەکی لەناو کاغەزەکانی سەرمێزەکەم هەڵستان کە هاتنە گوێم هەندێکیانم ناسینەوە و هەندێکیان نەء ..،

دەنگێك زۆر لە دوورەوە ئەهات  زانیم ئەوە هی ئەو گۆرانیبێژەیە کە خۆشمەوێت کەچی ئەگریا .. گریانێك .. وەك ئەوەی بڵێی لە ژوورێکی تەنیادایە و بۆ شتێك .. خەمێك .. قەهرێك ئەگری .. لێ نەمزانی قەهرەکەی هی میللەتێکە یان گوڵێك .. هی وەرزێکە .. یان گەڵایەك .. یان هی پشیلەیەکە .. ویستم بیر بکەمەوە ..، ئەبێ ئەم گۆرانیبێژە دەنگخۆشە بۆ بگریت ..؟ ویستم پێشبینییەك بکەم .. وێنەیەك لە خەیاڵی خۆمدا بنوێنم .، تەماشای وێنەکانی گریان بکەم .. کەچی یەکسەر چریکەی ژنەکەم  وەك ئەوەی سواری گڤەی با بووبێت هات و هاواری کرد ...، کچەکەم .. کچەکەم.. کچەکەم ..، دەنگەکە ئەوەندە خێرا هات ..، نەمتوانی لەگەڵ نەفەسێکدا .. لە هەناسەیەکدا بیگرم .. زۆر بە خێرایی تێپەڕی و گوێچکەیەکی منی لەگەڵ خۆ برد ..، دەنگەکە لەناو ئەو گوێچکەیەمدا هەر ئەزرینگایەوە .. دەنگی ژنەکەم زۆر لە جاران تیژتر و بەهێز تر بوو .. ئەو هەمیشە زوو زوو ئەیچریکاند .. هەر زیندەوەرێکی لە پڕ دیتبا زیرەی ئەکرد.. زۆر ئەترسا و هاواری ئەکرد.. لێ ئەمجارە دەنگەکەی زۆر ترسناکتر و خەمبارتریش دیار بوو .. دەنگەکەی لەناو ئەو گوێچکەیەی کە لە لای خۆم مابۆوە .. نەما،  لێ لەناو مێشکمدا دەنگەکە هەر ئەهات .. کچەکەم .. کچەکەم ..، تێکەڵ بەدەنگی گۆرانیبێژەکە بۆوە .. کە لەو کاتەدا زۆر نزیك ببۆوە .. هەر وەك ئەو جارانەی کە کچەکەم دەنگی ریکۆردەرەکەی لە پڕ بڵند ئەکرد و دەنگی گۆرانیبێژەکەش یەکسەر بڵند ئەبوو و جرفێکی بە کچەکەم دائەدا .. ئێستاش دەنگەکە وا بڵند بۆوە .. بۆ کەمتر لە چرکە وەختێك وامزانی لە ژوورەکەی خۆمم و کچەکەم لە باوەشە و دەنگی ریکۆردەکەی زیادکرد .. لێ دەنگەکە ئەینالاند ..

پرسیاری وەنەوشەکان لە تۆ ئەکەم .. پرسیاری مەلەکان لە تۆ ئەکەم .. پرسیاری کوریکەکانی بەهار .. گەڵاکانی پاییز .. کلو بەفرەکانی زستان و گەرمایی

تەمموز .. پرسیاری ئاسودەگی .. دڵنەوایی .. بەختەوەری لە تۆ ئەکەم .. هاتووم و باهۆز و کۆتر و کێڵگەی گەنم و گەلە گورگێکم لە گەلە .. کەروێشك و ڕێوی و بەرخۆڵەو کاریلەی جوان جوان .. تا لە هەوارەکانی تۆدا پرسیاری ژیانێکی کامەران بکەن .. هاتووم پرسیاری تۆ ئەکەم .. ئەی ئەوەی سەرەوە و بنەوە و دەوری تەنیشتەکانی من و ئەم مەلە بەستەزمان و وەرزە نابووتانەت داوە و خۆت بزر ئەکەیت ، وەرە من هاتووم وەڵامی ئەو پرسیارانەم ئەوێت کە شعرەکان و ئاوازەکان لێیان کردم .. پرسیاری ئەو کەمانچە مەلعونەی کە هەرگیز بێ مەعنا عەزفی خۆی ناکات .. پرسیاری ئەو دەفە پڕ لە شەتحات و فڕینە .. پرسیار گەلێك .. کە منی گۆرانیبێژ .. منی کوشتەی جوانی .. سەرسام بە لەزەت و توانەوە لە شۆخی وشەکان .. منی مەراقی فڕین و هەستان و گۆرانی گوتن لە بێهوشیدا ..، هاتووم وەڵامی پرسیارەکانی ئەو کەمانچەم ئەوێت کە لەغەیبوبەدا لێم ئەکات ..، بەرسڤی پرسیارەکانی ئەو دەفە ..، کە لە حەرامزادەییدا لەگەل هەژانی خۆیدا ئەیانژەنێت ..، هاتووم ئەپرسم .. کوا .. کوا .. گۆرانی .. گۆرانییەك وەڵامی پرسیارەکانی کەمانچە و دەفەکانی من بداتەوە .. وەڵامی وەنەوشەی ئینجانەکانی ژوورەکەم و ئەو کەروێشکەی لە سەر کاغەزی نۆتەکانم هەڵبەز ئەکات .، هێشتا گۆرانیبێژەکە دەنگی نەبووە زایەڵە .. لە پڕ دەنگ و تەپەی دەفێك هات .. دەفێك ئەتگوت پێشوازی لە تەرمێك ئەکات .. یان هەواڵی شەڕێك .. یان کوشتنێك رائەگەیەنێت .. ئەتگوت وا بە دەستی دەروێشێکەوە کە خوێن لە پەنچەکانی فیچقە ئەکات .. هاواری کرد .. کوژایەوە .. کوژایەوە .. نەمزانی .. یەکێك ، سەرکردەیەك لە شەڕێکی بێمانادا کوژرا .. یان دیسان پیاوێك .. ژنێك یان کچێکی بۆ ئابڕوو شوشتنەوە کوشت .. یان ئەستێرەیەك رژا .. بێدەنگییەکی شکۆمەند .. هەموو دەماغی داگرتم ..

هیچ دەنگێك نەهات نەمزانی چبوو کوژایەوە .. دەنگەکان .. هیچیان نەمان .. چەند چرکەیەك وا بێدەنگ رۆیشتن .. هەستم کرد کاسەی سەرم ئەگوشرێ .. بە بێدەنگی ئەگوشرێ .. مێشکم ئەیەوێت لە نێو تەپلی سەرمدا بێتە دەر .. هەستم کرد سەرم گەورە ئەبێت .. تەنیا مێشکم ئەکشێت .. لە کاسەی سەرمدا جێی نابێتەوە .. ئەیەوێت بێتەدەر .. ویستم بە هەردوو دەستەکانم سەرم بگرم کەچی کە دەستەکانم بەرزکردنەوە شتێك لە مشتما نەبوو سەری خۆمی پێ بگرم .. پەنجەکانم نەمابوون .. کوانێ پەنجەکانم ..؟ ئەم پرسیارە لە یەکێك لە خانەکانی مێشکم پەڕییە دەرەوە بێ ئەوەی ئاگام لێبێت .. بێ پەنجە مامەوە .. کوانێ پەنجەکانم ..؟

من ئەو هەموو وەنەوشە و هەڵاڵانەم خستوونەتە باخەڵمەوە .. ئینجانەیەك نازناز و شەوبۆم بۆ هێناوی .. ئەی سەروەرم .. بەس پێم بڵێ .. چیت لە پەنجەکانم کرد .. کەمانچە و دەفەکەم .. باخچەکەم .. بێستانەکەم هەموویان پرسیاری ئەوەم لێئەکەن .. پەنجەکانم بدەیتەوە .. گەر پەنجەکانم نەدەیتەوە .. بەچی مۆزیکاکانم بژەنم ..؟ بە چی باخچەو بێستانەکان ئاسوودە بکەم ..؟ ئەگەر نا ئەکوژێنەوە .. ئەکوژێنەوە ..،

کە دیسان ئەم دەنگە هاتەوە و دوای ئەم وشانە کوژایەوە .. گوتم دیارە هەموو کەسەکان پەنجەکانیان بزر کردووە .. لەو دەمەوە کە ئاگام لە کاسەی سەرم نەمابوو .. گوتم ئەبێت ژنەکەم گوتبێتی کچەکەم .. یان پەنجەکەم ..؟ کە دەنگەکەی بێرەدا تێپەڕی ..؟ نەمزانی دەنگەکەی بە مێشکمدا یان بە گوێچکەمدا تێپەڕی .. ئەوەندە خێرا بوو ئێستا نازانم چۆن دڵنیابم کە گوتی کچەکەم یان پەنجەکەم .. پرسیار لە کێ بکەم ..، لەبا ..، یان لە کتێبەکان .. لەو پیاوە زەریفانەی لە کتێبخانەکەمدا لە گەل ژنە شەرمنەکاندا زۆر بە ئەدەبەوە قسە ئەکەن ..، یان لەو منداڵەی لەناو چیرۆکێکەوە .. دێتە دەرێ و فشە بە هەموو شتێك

ئەكات و چیرۆكێكیش نییە بە جدی ئەم منداڵە بكاتە پاڵەوانی خۆی و ئەویش رازی نییە لەو چیرۆكی مندالأنەدا .. هەروا بە گێلی بمێنێتەوە و یاخی نەبێت و شتی ناماقووڵ و سەیر و سەمەرە نەكات .. ئەو منداڵە بیژمۆتەیە .. یەكەم جار من كەبینم ئەو لە چیرۆكەكەدا لاگیرە و بەقسەی نوسەرەكەی .. خۆی تێكەڵ بەمنداڵەكانی دی ناكات و گوێناداتە ئەو نوسەرە بەتەمەنەو حەز ناكات ببێتە بەشێك لەو یارییە .. گوتم ئەو هەتیوە شتێكی لە بن سەردایە .. كە دواندم گوتی .. من لە وەرزێكی تووڕەهاتەوە هاتووم .. من باوك و دایكم لە شەڕێكەوە كوژران كە هیچ پەیوەندی بە وانەوە نەبوو .. من لە باخچەیەكی تووڕە هەڵاتم كە نەیئەزانی عیلاقەیەك لەگەل با دا ببەستێ .. نەیئەزانی زریانێك هێور كاتەوە .. من لە .. مەكتەبێك رامكرد .. كە فێری نەئەكردم چۆن بژیم .. چۆن لە گەل منداڵەكاندا ببمە هاوڕێ و هاودۆست و هاوخەم و شەریكی قەهرەكان .. من هەڵاتم ، لە وێوە

هەڵاتم .. كە هیچ ئومێدێك نەبوو بۆ جوانی .. بۆئاسوودەگی .. بۆ ژیان .. هاتم و ئەو نوسەرەش ناهێڵێت گەورە بم .. ناهێلێت دەم لە پرسیارەكانی خۆم بدەم .. ئەم نوسەرە بەدبەختە نایەوێت منداڵەكان پرسیارەكانی خۆیان بكەن .. تۆ سەیركە ئەو .. ئەوانی بە ڕاوە كۆتر و كوشتنی هورچەكانەوە چۆن خافڵكردووە ..؟ چۆن چاوی هەموویانی كوژاندۆتەوە .. چۆن گوێچكەی هەموانیانی گرتووە .. نایەڵێت من كچەكان ماچ بكەم .. گوایە گچكەم و مەفروزە من ئەو شتانە نەزانم .. نایەڵێت شەوێك تا بەیانی دانیشم و روو لە ئاسمان بكەم و بڵێم ئەی ژیان .. تۆ وەك مردنی باوكم و دایكم بێ مانایت .. نایەڵێت بە وەرزەكان بڵێم هەمووتان نوقسانن و پێكەوەش ناتوانن تەنیا ساڵێكی بەختەوەر پێك بێنن .. ئەو نوسەرە نایەڵێت .. ئێمەی گچكە شتی گەورە بڵێین .. كە ئەو خۆی نازانێت هیچ بڵێت .. رێ نادات منیش مایەپووچی ئەو بدركێنم .. هیچ نەوتنی ئەو

ئاشکراکەم .. بڵێم ئەو فێل لە مناڵەکان ئەکات .. فێڵی گەورەیان لێئەکات .. ئەو .. وا نیشان ئەدات کە کلیلی دەرگەکانی بەختەوەری و ئاسوودەگی لایە بۆ منالآن .. کەچی درۆ ئەکات .. ئەو وا ئەزانێ منالآن بە نوقلآنە و .. بادام و باسوق خواردنەوە ئەبنە پاڵەوانی ژیکەلەی چیرۆکەکانی .. کەچی نازانێ ئەو خۆی پێش مناڵەکان فریو ئەدات .. بڕۆ .. بڕۆ .. ئەی نووسەری نابووت .. بەدبەخت .. کەم ئەقڵ .. بڕۆ پرسیاری بەختەوەریت لە ئاقارێکی دی بکە ..جیا لە ئاقاری نووسین .. دوور لە دونیای حەرف و شتەکان .. بڕۆ دوور لە مەڵبەندەکانی منداڵی بڕشێوە .. بڕۆ تۆ لێرەدا نە گەورە ئەبیت و نە مناڵەکانیش گەورە ئەکەیت .. لێرەدا نە زیرەك ئەبیت و نە مناڵەکانیش پتر گێل ئەکەیت.

کوژایەوە .. کوژایەوە .. تەپەی دەست و پەنجەی دەروێشانەی .. گۆرانیبێژەکە لە سەر دەفەکە هەڵسا ..، لێ دەنگەکە حەقیقی نەبوو .. تەنیا یادگاری ئەو دەنگە بوو .. کە دواجار من و کچەکەم لە ریکۆدەرەکە پێکەوە گوێمان لێئەگرت و ئەو دەنگەکەی بەرز کردەوە ..، ئەو مناڵە بێ پەنجەیە .. پرسیاری ئاسوودەگی ئەکات .. وەڵامی بدەوە .. ئەی پیری تەنیای سەرە و بنەوە و تەنیشت و روخەکانی من .. ئەو کەمانچەیە .. ئەو مناڵە .. ئەو دەفە .. ئەو وەرزە تورەی پایزە.. وەڵام .. وەڵام .. بەر لەوەی لەم سۆراخەدا بزر بم .. بەر لەوەی لەم باخچەی هاوار و ناڵینەدا فێ بگرم .. بەر لەوەی لەو پایزەدا .. لەو ئینتیحارەدا .. منیش بکوژرێم .. وەك دایك و باوکی ئەو کوڕە نەفرەت لێکراوە .. وەك ئەو کوکوختییانەی مناڵێکی پەروەردە بووی چیرۆکەکان .. بە دار لاستیکەوە کە باوکی پێش ئەوەی ژنەکەی خۆی لە سەر ناموس بکوژێت و پێش ئەوەی خۆشی لە شەڕێکی دەستە و یەخەی بێ ئامانج و بێ هۆدا بکوژرێت .. بۆی دروست کردبوو .. بەر لەوەی منیش وەك کوکوختییەکان لە سەر دەستی ئەو منالآنەدا

بکوژرێم .. لەسەر دەستی ئەو منالأنەی کەبەیانی ئەوانیش رەنگە کە بێ دایك و باوك گەورە ئەبن و .. چیرۆکنوسەکەش نایانێرێتە مەکتەب و فێرە خوێندن و نوسینەوە و خەون بینین و عشق و فڕین نابن .. ئەبن بە شاگردی حەلاقێکی چ نەزان و فیتەرێکی دڵرەق و دارتاشێکی فشەکەر و لەبەر دەستی .. شوفێرێکی نەخوێندەواردا کار ئەکەن و .. دواییش ئەبنە پیاو و خاوەن شەرەف و خوشکەکانیان لەسەر ناموس ئەکوژن.

تۆ ئەو کوڕە چاو جوانە بپارێزە .. من ئاگام لە پەنجەکان و کچەکەم نەما .. تۆش خەمی ئەو گوڵ و کەمانچە و دەفەتە .. ئەو نوسەرەش خەمی ئەو منالەیەتی کە هەندێ جار پرسیاری لە خۆ گەورەتر ئەکات ..، ئەو پایزەش وا خۆی تالأن ئەکات و بەردەوام هەڕەشە ئەکات و باسی بەهار و وەرزەکانی دی ئەکات .. خەریکە سەرمای زستان بە درۆیەکی گەورە و بوختانێکی گەورەتر لە قەڵەم ئەدات و ئەڵێت

ئەوانە لە خەزنەکانی منەوە دزراون و زستان خۆی پێ با ئەدات .. ئەوەی زستان شانازی پێوە ئەکات .. لە رەحمی ئاسۆکانی منەوە دێنە دەر .. ئەوەی زستان بە ماڵی خۆی ئەزانێت .. ئەوە ئاسمانی منە ئەیبارێنێ .. زەوییەك نییە بۆ زستان بەفری تێکات .. ئاراستەیەکی نییە بۆ باوبژە تا تیای هەڵکات .. زستان بێناموسییەکە لە زەمەن بەحەرامییەوە کەوتۆتە خوار .. بیژایەتییەکە لە جووڵە ناشەرعییەکانی زەمین .. بەفربارین رقی زستانە لە غروری من .. کاتێك سرووشت رووت ئەکەمەوە ..،

باران بارین قینی زستانە لە نەرجسییەتی من کە زەمینەکان و رەگەکان تێنوو ئەکەم ..، هەرگیز باوەڕ بە زستان مەکەن بەوەی بتوانێت بۆ زەوق بێمەبەست .. بەهەوەس .. دوور لەمن و لە رقی من .. تۆفانێك یان زریانێك لە خۆیەوە هەڵسێنێ .. هەر گیز ئەو ناتوانێت .. دوور لە من

هەنگاوێك بە هەورەکان بهاوێژێت و زریانێك لەو باخچانە بەرپا بکات .. زستانیش وەك بەهار وەك هاوین درۆزنە و هەرگیز لەگەل دارێکی رووت .. بەردێکی تەڕ .. باخچەیەکی سارد .. زەمینێکی شەختە گرتوو .. راستی نادر کێنێت و هەمیشە پێیان ئەلێت ..، منم تەمەن درێژترین وەرز و بەهێزترین وەرز و راستگۆترین زەمەن .. منم خاوەنی سپیترین بەرگ و جوانترین زەمەن بۆ گەمەی فریشتە و خۆشی میزاجی یەزدان .. ئەتوانم هەتاو و باران ، بەفر و تەرزە ، بۆنی خاك و ئاو تێکەڵ بەیەك بکەم و وەك چەپکێ گوڵ بیدەمە جوانترین و تورەترین فریشتەی یەزدان .

کچەکەم .. کچەکەم .. ئەوە دەنگی ژنەکەم بوو .. دڕی بەدەنگی پایزەوە دا و وەك وەرزێکی تورەتر لە پایز .. مەغرورتر لە پایز مەلعونتر لە پایز .. گوێچکە تەنیاکەمی تژی کرد .. گوتم ئەی ماڵت خراب نەبێت .. وامزانی دیسان مشکێکت دیت ؟! پێی گوتم .. پرسیاری پەنجەکانت بکە .. پەنجەکانت .. پەنجەکانت ؟!

کە گۆرانیبێژەکە .. ئەمجارەیان دەنگی گۆڕا ناڵینەکەی بووە گریان .. پەنجەکانم .. پەنجەکانم .. رەنگە هەر کەسێکی دی جگە لەمن گوێی لێبا .. لەگەل ئەودا هاواری کردبا .. پەنجەکانی .. پەنجەکانی .. بیدەرەوە ئەی سەروەر و سەردارەکەم .. پەنجەکانی بدەرەوە .. ئەی چاو جوانە رۆح شیرینە دڵ پڕ بەزەییەکە بیدەرەوە .. هەمووی نەخشی خۆتە .. ئاوازەکان هی تۆن .. بیدەرەوە .. با هێشتا لەو ئاوازانەت بژەنێ .. با هێشتا سحرەکانی تۆ بەو چەم و باغ و بێستان و خەلیاقەتەوە ئاشنا بکات .. بیدەرەوە .. ئەی گەورە خۆت .. گەورە لە عشق .. گەورە لە سۆز .. گەورە بە رەحمەت و جوانی .. گەورە بە ئیشراق و رووناکی .. بیدەرەوە .. ئەو خۆی موڵکی خۆتە .. بەدەنگ و رەنگ و گۆرانی و ئاوازەکانەوە .. هەمووی سەدای دەنگی تۆ و ئاوەزی تۆ و زەوقی

تۆیە .. تۆ خۆت نەخشەسازی شتەکانی .. ئێمەش تەنیا داواکارێکی مەلعون و خوازخوازێکی پەرپووتین و پێت ئەڵێین بیدەرەوە .

ویستم هۆیەك ببینمەوە تا داوای پەنجەکانم بکەمەوە .. خۆ من مۆسیقاژەنێك و گۆرانیبێژێکی سەرسەخت نیم تا داوای پەنجەکانم بکەمەوە .. بۆ چیمە ..؟ ئەگەرێك نەبوو داوای پەنجەکانی پێ بکەمەوە .. پەنجەکانم بۆ کوێ ڕۆیشتن ؟ نازانم .. ویستم بیربکەمەوە بزانم بۆ کوێ ڕۆیشتوون ؟..بەڵام هەر زوو گوتم ئەم هەوڵە بێهودەیە بۆچ ؟.. بۆچی بزانم بۆ کوێ ڕۆیشتن ؟.. هەستم کرد نامەوێ بزانم .. پێویست نەبوو بزانم .. زانیم من چ ئیشێکم پێ نیە .. دوایی گوتم .. خۆ ماقوول نیە پەنجەکانم بێ کارێکی پێویست چووبن ؟.. حەتمەن چوونەتە کارێکی پێویست .. ڕەنگە چووبن هەندێ وەنەوشە بچنن .. یان لە چەمی بەهارێکی خۆشدا گەمە بە ئاوێك بکەن .. یان دەستی پایزە تورەکە بگرێت تا گڕ بەرنەداتە خۆی .. یان قژی شەنگەبییەك دابێنێ .. یان هەر کارێکی دیکە بکات.

دیسان لە پڕ ژنەکەم هاواری کرد .. گوێچکەکەت .. گوێچکەکەت ..، بیرم کەوتەوە ئێستا من بێ پەنجە و بێ گوێچکەیەکم ، یەکەم شت کە بەمێشکمدا هات ، گوتم یەك گوێچکەم بەسە .. دووانم بۆ چییە ؟ وەك چۆن یەك دەستم هەیە با یەك گوێچکەشم هەبێت .. لەو ساتەدا .. ئارەزوویەکی دژوار رایپێچام و تورەی کردم .. زۆر سەیر بوو .. دەنگێك لە ناوەوەی مێشکمدا هات و گوتی : دوو چاوت بۆ چییە ؟ چاوێك بەسە ..! چاوێك بەسە بۆ دیتنی باخچە .. بۆ دیتنی حەحقیقەت .. بۆ دیتنی خواش یەك چاو بەسە .. هاوارم کرد گوتم بیبە .. چاوێکم ببە و لەو ئازارە کوشندەیە رزگارمکە .. لەو ماوە کورتەدا ئازارێك هەموو جەستەی هەژاندم .. ئازاری چاوی راستەم بوو .. هاوارم کرد دەریبێنە .. چاوێکم بەسە بۆ بەختەوەریم .. ئاسوودەگیم .. دەریبێنە ئەی خاوەنی

هەموو چاوەکان .. ئەی خاوەنی چاوی من و
گورانیبێژ و وەرزەکان .. هی ڕێحان و مار و سەگ و
پشیلەکان ، خاوەنی چاوی هەموو پیاوەکان ..
هەموو ژنەکان .. هەموو ئافەریدەکان ..، دەریبێنە ،
بەو پەنجە پڕ میهرانەی خۆت دەریخە ، وەك ئەوەی
دەنکە خۆخێك دەربێنی .. وەك ئەوەی دنکە
مژمژەیەك لەناو دەمتا تووڕ هەڵدەیت .. ئاوا چاوەکەم
دەربێنە و فڕێیدە .. چاوێك بەسە .. ئەوەی دی فڕەدا
.. بۆ کوێ فڕێی ئەدەی کەیفی خۆتە .. تۆ لە من
باشتر ئەزانیت توڕی هەڵدەیتە کوێ ..، ئەو چاوەم
ناوێ .. ئەمەیان چاوێکی حیزە و بەس تۆ ئەزانیت چ
بەلآیەکی لەناو خۆیدا حەشار داوەو .. چ لەعنەتێکی
شاردۆتەوە ..؟ فڕێیدە .. ئەی سەروەرم فڕێیدە .. بۆ
کوێ؟ خۆت ئەزانی ..! دەریبێنە و با لەو نەفرەتە
ڕزگارم بێت .. لەو لەعنەتە قورتالم بێت .. چاوێك
بەسە بۆ تەماشەکردن .. کە چاوێك بەس بێت..
حیکمەت چییە .. دوو چاوت دامێ؟! حیکمەت چییە

دوو ڕەشێنە و دوو برژانگ و دوو برۆ و دوو پێڵوم پێ
ببەخشیت .. بیبەرەوە بۆ خوت بیبەرەوە .. دەریبێنە
وەك ئەوەی خەیارێك بۆ دوڵمە بقەورێنی .. ئاوا چاوی
ڕاستەم بقەورێنە، برۆ و برژانگیشی لەگەڵ هەلکێشە
..چاوەکەم لەو حەلەدا هەموو جەستەی ئازار ئەدام ..
پەنجەکانم نەمابوون ئەگەر نا یەکسەر دەرم ئەکێشا
.. دەرم ئەهێنا و فڕێم ئەدا .. هاوارم کرد .. چاوەکەم
.. چاوەکەم ، ئەمکوژێت ..، بیکوژێنەوە، ئەم چاوە
مەلعونە بکوژێنەوە..، بیکوژێنەوە تا نەیکوشتووم ..
بیکوژێنەوە .. تا بێ هۆشی نەکردووم ، تا
نەیگریاندوم .. بیکوژێنەوە..، جەستەم بێزارە لەو
چاوە لەعنەتییە .. نامەوێت چیدی لەگەڵ ئەو چاوەدا
بچمە ژوانی سێبەرەکان .. کتێبەکانی پێ بخوێنمەوە..
شعرەکانی لەبەردا بنووسم .. بەسەر کاغەزەکانی
خۆمدا بیانگێرم .. نامەوێت حەرفەکانم ، وشەکانم
تەماشا کات ..، ئەمە چاوێکی بەدە .. ڕەنگە وێنە و
نیگار و تارمایی هەموو ئەو کوژراوانەی تێدا بێت..،

که له کتێبخانەکەمدا لەناو کتێبەکاندا کەوتوون و تا ئێستاش هەر هەموویان زیندوون و نەمردوون..، بەڵێ ئەوان کوژراون له شەڕەکاندا ، له شەڕە زۆر و گەورەکاندا کوژراون .. لێ لەناو کتێبەکاندا نوسەرەکان ژیانێکیان پێ بەخشیون و نامرن..، زۆریان نەفرەت له ژیان و گوڵ و سەنگەر و تفەنگ و مناڵەکانیش ئەکەن .. دونیای ئەو کوژراوانە زۆر سەیرە ..، هەندێکیان که هێشتا خوێنیان لەبەر ئەڕوات هاوار ئەکەن .. با بڕوا ئەم رووباری خوێنە .. با بچێت گوڵەکانی باخچەکان ئاودات .. باخچەی شارەکان .. ئەو شارانەی غەرقن له تاعون و تاوان و ئافات .. با بڕوات ئەم رووباری خوێنە تا بەر ماڵی سەرکردەکان و ژنەکانیان له جیاتی خەنە بیدەن له پەنجەکانیان و فوو له دڵوپەکانمان بکەن لەسەر گونی مێردەکانیان ..، با بڕوا ئەم رووباری خوێنە .. بچێتە ناو چیرۆکەکانی داپیرە، تا وازبێنێت هێندە باسی فریشتە و یەزدان نەکات و چاوێکی لەو برینانەی ئێمەوە بێت .. ئەو برینانەی ژنەکانمان له دڵیان کردین پێش ئەوەی بێینە جەنگ .. ئەو ژنانەی دوای هەموو ماچێك و تێکەڵبوونێك تفێکیان ئەکرد بە ناوچاوانمانەوە .. ئەو ژنانەی هەمیشە تێر نەئەبوون ، هەموو ساتێکی دەست بەتاڵییان بەو لەش و گۆشتە مەلعونەوە بەسەر ئەبرد .. ئەو ژنانەی له پشتەوە خەنجەری خۆیان ئەوەشاند و ئێمەش وامان ئەزانی رێحان ولاسکە گوڵمان تێ ئەگرن .. ئەو ژنانەی که له بنماندا بوون و بە خەیاڵی کەسێکی دیکەوە .. پیاوێکی دیکەوە .. پیاوێکی دڵرەقتر .. بازوو پفتر .. سمێڵ گەورەتر و بەهێزترەوە پێئەکەنین .. پێئەکەنین و له بن لێوانەوە یان له دڵی خۆیاندا ئەیانگووت .. تف ئەی پیاوی کزۆڵەی بێ شەرەف .. ئەی گەوادی بێ تاقەت .. که تۆ ساڵێك ئەوەندەی پشیلەیەك ناپەڕیت .. بۆ چیتە له گەڵتدا بە وەفا و بە شەرەف بم .. بۆچی لەژێر هەیوانەکەتدا خیانەت نەکەم ..، که تۆ کوشتەی لەشی خۆتی .. بۆچی من تەرمەکەت

بلاوێنمەوە .. بۆچی لەگەل تۆدا تالأوی ئەم نەفرەتەت لەگەل بچێژم .. بۆچی لەگەل تۆدا بەرەو ئەو کوژانەوە بڕۆم ... من چاوم لەو شۆقانەیە کە لە جەستەمەوە وەك نوور .. وەك چریسکەی چەخماخە و بریسکەی ئەستێرەکانەوە ئەرژێن .. بڕۆ تۆ لە شەڕێکدا خۆت بکوژە ، کە جیێ پیاوە شەرمن و بێ هێز و بێ تاقەت و بێ شەهوەتەکانە .. بڕۆ لەوێدا بمرە ..، بمرە بە دەستی ئەو پیاوانەی دەستێکیان زنجیرە و دەستێکیان لە باخەڵێکی پڕ لە مەمك .. چاوێکیان لە سەر دوژمنە و چاوێکیان لەسەر لەشی گۆشتی سۆزانی .. لایەکی بیریان بە خەریتەکانی شەڕ و شەڕگە مەشغولە و لایەکەی دی بە نێچیری ئەم شەوە .. ئەوان وا بیر ئەکەنەوە .. کێ ئەزانێ ئەم شەو دوژمن ئەشکێت یان ئەباتەوە .. کێ ئەزانێ ئێمە ئەکوژرێێن یان سەرئەکەوین .. شەڕەکان تەواو نابن ، ئەم شەویش نا .. شەوێکی دی ، ئەم شەڕەش نا شەڕێکی دی .. لەسەر ئەم چیایە نا ، لەسەر گردێك .. لە کۆلانێك نا ، لەسەر شەقامێك ...، بە گوللەی شەڕکەرێکی شەریف نا .. بە دەستی مناڵێکەوە .. رەنگە لە دوورترین و بێزەوقترین و پیسترین جێدا بکوژرێێن. دوور لە دەنگی گۆرانیبێژێکی خۆش .. دوور لە باوەشی گەرمی قەحپەیەکی تەڕو بڕ.. وەك چایەك ساردبینەوە و کەس بە تەرمەکەشمان نەزانێت ... بۆگەنی بین و مێشەکان یەکدی داوەت کەنە سەر چاوو گۆشتی کەپوو و ناو ددانەکانمان.

بڕۆ ئەی ڕووباری خوێن .. بڕۆ پێیان بڵێ .. بە دانیشتوانی ئەم باخچانە بڵێ .. کوشتن شەریفترە لەو ترسەی کە لە سەنگەرەکاندا مرۆۋ هەراسان ئەکات .. ئەم مەرگە خۆشترە لە گومانی ئەو ژنانەوە کە لە ژێر پێخەفدا ئەماندەنێ .. ئەم مردنە بە کەیفترە لەو پێکەنینە کوشندەیەی ژن کە لە راکشاندا بۆ کەسێکی دی .. پیاوێکی دی ئەیکات .. ئەم نوستنە خۆشترە لە تەسەوری ئەوەی ژنەکانمان لە باوەشی پیاوێکی دی ئەگریێن و گلەیی لە بەختی رەشی

خۆیان ئەکەن لەگەل مێردەکانیاندا .. کە لە باوەشی پیاوێکی سەرڕەق و دڵڕەقدا گازندە لـە مێردەکانیان ئەکەن و بێهوودە فرمێسك ئەڕێژن و خۆیان تەسلیمی ئەو پیاوە بێ ئەمانانە ئەکەن و خۆشحال ئەبن بەو تەسلیم و راکشانە لە بن ئەواندا .. بڕۆ ئەی رووباری خوێن .. با وڵاتیش تێبگات ئێمە کوشتەی غەدری ژنەکانین .. کوشتەی پیاوە سەر سەختەکانین. کوژراوێك .. لە ناو ئەو رووباری خوێنەدا هەڵسایەوە و قاقا پێئەکەنی .. وەك ئەوەی لەناو رەوەزێك گوڵ هاتەدەر .. کەوتە غار .. سووکسووك بازی ئەدا .. وەك ئەوەی لە گـەل رەوە مامزێك هەڵبەزێ و دابەزێتەوە.. سینگی کردەوە جێی چوار گوللەی لێ دیـار بـوو .. لـە پشتەوەی جێی دەرچوونی گوللەکان کە زۆر گەورە ببوون .. لە هەر کونێکەوە دەیان کۆتر لە پڕ دەرکەوتن و لە شەققەی باڵیان دا ..، کۆتری رەنگاو رەنگ ..، سپی و پەمەیی و کـەسك و سور و زەرد و رەش و نارنجی و زۆر رەنگی دی .. هاواری کرد .. من

شەهیدم ، من شەهید .. رێمدەن با لەو باخچانەوە ، کە زۆر جوان دیار بوون ، بچمە دەر و لە باخچەکانی بەهەشتدا بچم قەرزەکانم وەرگرمەوە .. لێم گەرێن با لەو هەوارە ترسناکەدا ، کە زۆر جوان و تەنا دیار بوو ، با بچمە دەر و لە ئاسمانێکی دیکەدا ، لە کۆشکێکدا لە گەل فریشتەکان دانیشم ..، رێمدەن با لەو مێرگە پڕ وەحشەتە ، کە زۆر خۆش و فێنك دیار بوو ، بچمە دەر و لە هەیوانیماڵەکـەمـدا لە گەل پڵنگەکان یاری بکەم .. من زوو یارییە تووڕەهاتەکانی منالێم جێهێشتن تا بـگـەمـە ئەم یارییانە .. من زوو دونیای فانیم جێهێشت تا بگەمە گەمە خۆشەکانی ئاخیرەت ..، رێمدەن با دەرچم .. لەشەقام و مەکتەب و کۆشك و تەلارە بەدفەڕەکانی ئێوە و لە عەرشێکدا بگیرسێمەوە کە خۆم بە شەهیدکردنی خۆمدا ، بەدەستم هێنا ..، کێ هەیە رێم لێبگرێت .. تا نەچمە ئەو کۆشکە و هەموو حۆرییەکان رووتکەمەوە .. کێ هەیە رێی پەنجەکانم نەدات خـۆی بە شیـری مەمکی فریشتەکان

تەڕ نەکات .. من شەهیدم .. من شەهیدم .. کە چاوەکانم کوژانەوە ، من رووناکی بەهەشتێکی پڕ حۆریم بردەوە .. کە دەستەکانم بڕانەوە .. من نیعمەتەکانی بەهەشتێکی لەزەتدارم پێگەییشت ..، کوژراوێك لەولاوەتر .. کە هێشتا بۆنی بارووتی لێئەهات و دووکەڵی سووتانێکی گەورەی لێهەڵئەستا .. هاواری کرد درۆ ئەکەیت .. درۆ ئەکەیت..، ئەی فیتنەی ئینسان درۆ ئەکەیت ..، تۆ لەو سەنگەرە نەبوویت کە کوژاریت .. تۆ لەو بەرەیە نەبوویت تا شەهید بیت .. تۆ ناسنامەی بێگوناهترین تەرم و مناڵترین کوژراوت دزی و خۆت لەو باخچە ساوایەدا کردەوە مناڵ و گڕت بەردایە گەورەییت .. تۆ ئەو مناڵە کوژراوە نیت .. تا خوا هەڵتکێشتە ئەو ئاسمانە گوڵدارە .. بتباتە ئەو باخچەیە رەنگینە .. ئەو هەوارە خۆشەی بۆ مناڵە کوژراوەکان ئێواران لە حەوشەکانی بەهەشتدا هەڵی ئەخات.

درۆ ئەکەیت تۆ گەورە بوویت .. مناڵ نەبوویت ، تێبگە ئەحمەق تۆ ناچیتە بەهەشت .. گەورەکان ناچنە بەهەشت .. گەورەکان ناچنە بەهەشت .. ئەوان ناچنە بەهەشت .. ئەمانەی وت و رژایەوە ناو رووباری خوێنەکەوە ..، تەماشای کتێبخانەکەم کرد خەریکە هەمووی ئەبێتە خوێن و کتێبە بەرگ سپییەکان .. وەك پەڕەی گوڵ لەگەل خوێنەکەدا تەڕ ئەبن و نەرم ئەبن ..،

لەپڕ دەنگی کچەکەم هات .. هاواری کرد ، بابە .. پەنجەکانت ، پەنجەکانت .. چاوت ، چاوت .. گۆرانیبێژەکە زیرەیەکی سەیری لێ هەڵسا .. کە هەموو شتێکی لە بیر بردمەوە .. هاوار ، ئەم دونیایە بێ گۆرانی تامی نییە .. بێ گورانی سروەکان بەیانییان هەڵناکەن .. ئەستێرەکان ئەڕۆن و لەم ئاسماندا کۆچ ئەکەن .. بێ گۆرانی تەمەنی باخچەکان کورت ئەبێت .. وەرزەکان زیز ئەبن .. بمدەرەوە خوایە .. بمدەرەوە .. بەهرەکانی گۆرانی .. بەهرەکانی سۆز و

بەخشندەیی .. بەهرەکانی وەفا میهرەبانی .. بەهرەکانی سەفا .. زەوقی ئادەمییانە و ئاهەنگی خەیاڵ .. بمدەرەوە ئەی سەروەرم .. پەنجەکانم و گەرمایی ئاوازەکان .. دەمارە پڕ خوێن و گەرمەکانی ژەنین و راژانی ئەو دەفە هار و هاجەم .. بدەرەوە ..

هەستم کرد شتێك ئەگۆڕێت .. شتێکی سەیر ئەگوڕێت .. وەك ئەوەی بایەك ڕێڕەوی خۆی بگۆڕێت .. عاشقێك لە جیاتی ئەوەی بچێتە جێژوان .. یەکسەر بیری ئەکەوێتەوە کە شەڕێکی دەستەو یەخەی هەیە و ئەبێ بیکات و لەبیری چووە .. بۆیە ئەبێت نەچێتە ژووانەکە و ئەگەڕێتەوە ..، وەك ئەوەی دوکاندارێك ئەچێتە دوکانەکەی بەرێی ڕۆژانەی خۆیدا ئەڕوات..، بیری ئەکەوێتەوە .. کە ژنەکەی بێ شەڕەفە .. ئەبێت بیکوژێت ، بۆیە ڕێگەکەی ئەگۆڕێت و ئەگەڕێتەوە ..

وەك ئەوەی ژنێك مێردەکەی خۆی زۆر خۆشئەوێت و ئەیەوێت دیارییەکی بۆ بکڕێت .. لە پڕ بیری ئەکەوێتەوە کە مێردەکەی حەز لە خوشکی ئەو ئەکات ... دیارییەکە ناکڕێت و ئەچێتە دوکانی ئەو دوکاندارەی جارێکیان تەشقەڵەی پێکردبوو و خۆی ئەخاتە باخەڵی و خۆی ئەدۆڕێنێ ..، شتێك بە نامەعقوولی ئەگۆڕێت .. بێ مەنتق و ئەقڵ ئەگۆڕێت .. ڕووبارێك کە هەمیشە بەرەو ڕۆژهەڵات ئەڕوات لە کەللەی ئەدات بەرەو خۆرئاوا سەرکەوێت .. کە هەمیشە بەرەو سەروو ئەڕوات بەرەو خوار ئەبێتەوە .. گۆڕانێك وەك ئەوەی باخەوانێك بچێت چەندین نەمامی نوێ لە باخەکاندا بچێنێت .. کەچی خیانەتی دار و درەختەکانی بیر ئەکەوێتەوە و ژەهر بە باخەکاندا ئەکات.

مەلایەك بەرەو مزگەوت ئەڕوات تا نوێژی شەو بکات .. کەچی لە ڕێگەدا ئەو بێوەژنە سۆزانییە لەسەر ڕێدا کە هەموو جار بانگی ئەکات و ئەڵێت مەلا وەرە نیعمەتەکانی یەزدانت نیشاندەم و ئەویش ئەڵێت ئەخافو رەببی .. بەڵام لەم شەوەدا .. لەپڕ .. لە

چرکەوەختێکدا بێ پێشەکی و بێ قووڵبونەوە و بێ پرسیارکردن .. خۆی ئەکا بە ماڵی ژنەکەدا و .. دین و دونیا و ئاخیرەت و بەهەشت و تەنانەت خواشی بیر ئەچێتەوە.

شتێك ئەگۆڕێت .. جیا لە هەموو جاران .. جیا لە سروشتی خۆی .. جیا لەو عورف و عادەتە باوانەی بوونەتە بەشێك لە ژیانی رۆژانە و شەوانەی خەلیاقەتەکانی ئەم وجودە .. شتێك وەك ئەوەی شەقەزللەیەك لە دونیا بدات .. گوێچکەکانی ژیان رابکێشێت .. گونی زەمەن بگرێت .. شتێك کە لە خەیاڵەکانەوە نەهاتبێت .. لە عەقڵەوە نەهاتبێت .. شتێك دێت .. دەستێك دێت .. برینە کۆنەکان ئەکولێنێتەوە .. کەچی دەستی یادگار نییە، شتێك دێت .. وشەیەك دێت .. گەڵاکانی عومر ئەژاکێنێ .. کەچی مەرگ نییە .. هەناسەیەك دەمارەکانی پیاوەتی و ژنایەتی پف ئەدات.. کەچی با نیە.. خوێن نیە..، ئاسۆیەك بەسەر پەپولەکاندا ئەکرێتەوە .. کەچی فڕین نیە .. بۆنێك بەو مەعبەدانەوە بڵاوئەبێتەوە کەچی بخور نیە .. شتەکان لە رەگەوە ئەگۆڕێن .. کەچی شۆڕش نیە .. شتەکان لە بنوبۆتکەوە سەروو ژوور ئەبن .. کەچی فەوزاش نیە .. ئاشوب نیە .. شتەکان ئەگۆڕێن .. بێ ویست .. بێ ئارەزوو .. بێ ئەوەی دەستی مەراقێکی دیار .. یان سەری رەغبەیەکی ئاشکرا .. لە پشت ئەو گۆڕانانەوە راوەستابن .. بێ ئەوەی کەس بزانێت ئەمە چییە .. چ فێیەکە ئەم شەوە ئەگرێت و ئەیگۆڕێت .. شتەکان ئەگۆڕێن .. کوژراوێك دەسکە رێحانێکی لە زبڵخانەیەکدا کۆ کردبۆوەو لە ناو رووباری خوێنەکەدا هەڵسایەوەو هاواری کرد .. ئەی خوایە گیان .. بیدەرەوە .. حورمەت بەو رووباری خوێنە ، پەنجەکان بەو گۆرانیبێژە و نامووس بەو سۆزانییانە و بۆنێك بەم رێحانانە بکەرەوە .. دە تۆ .. ئەی سەروەری سەروەرەکان .. پەنجەیەکی پڕ میهرەبان بەو برینانەی مندا بکە .. فوێك لە هەناسەی مسکی تۆوە بەو فوارەی خوێنانەی

لەشمەوە بکە .. دەبا یەك دڵۆپ عارەقەی ناوچەوانی پڕ شۆق و نورت بڕژێتە سەر ئەو برینەی لە دڵمەوە .. هەموو ساتێك دەجار ئەمکوژێت .. خوایە گیان .. بمدەرەوە .. ژیانم بدەرەوە .. تا بزانم ئەمجارەیان لەو باخانە پیاسەیەکی بێ ئامانج بکەم کە ئێوارەیەك نەمکردن .. ژیانم پێبدەوە تا تێر سەیری هەتاو کەم و بۆنی رووبار هەڵمژم .

بمانبەخشە گەورەم .. بمانبەخشە .. هاژەیەکی خۆشتر بەو ئاوانەو .. گەڵایەکی سەوزتر و خەزانێکی زەردتر بەم دونیایە بێ سەروبەرەی مندا ببەخشە.

لێگەڕێ .. با رووباری ئەم خوێنە بڕوات .. بڕوات و تەرمی هەموو کچە جوانەکان ، ژنەکان ، لاوەکان و کوڕە باڵق نەبووەکان .. با بڕوا و تەرمی نێرگز و رەیحان و شاتان و ئەرخەوانەکان .. تەرمی پاساری و کۆتر و حاجی لەقلەق و رەشۆڵە و کەناری و شالوورەکان .. تەرمی ئەو لاسکە گیایانەی بە غەدر کوژران .. ئەو دڵۆپە ئاوانەی بە نامەردی خنکێنران .. با بڕوا و تەرمی هەموو ئافەریدەکان راکێشێتە بەر قاپییەکانی ئەم زەمین و ئاسمانە .. با مرۆڤ تێبگات .. چ توڕەهاتە ..؟! چ نەزانە .. چ هەژار حاڵە ..؟! با تێبگات .. مەرگ نایگەیەنێتە ئاسوودەگی .. کوشتن تەماحەکانی تێر ناکات .. تاوان خەزینەکانی عەقڵی زیاد ناکات .. کوشتارگەکان نایگەیێنە دوورگەکانی ئارامی .. گرێیەکانی ناکەنەوە .. بەو شەڕ و تەرم و کوشتنانەوە .. ژیان نابێتە لەپی دەست و .. دیانەتەکان نابنە چرا لەچاو و بن برژانگی ئەودا .. بەم شەڕ و شۆڕانەوە .. ژیان نابێتە پشیلەیەکی ماڵی و وەك مەمکی سۆزانییەکان دەستییان لێبدات .. با ئەم رووباری خوێنە بڕوا و .. مرۆڤ بگرییێت و بزانێت چ قەلەندەرێکە .. چ بەدبەختێکە ..چ ...

هات وەك رووباری خوێن و ویزەی گوللەیەکی شێتەوە هات .. و هاواری کرد .. ئەی پیاوەکە.. کچەکەم .. گوێچکەکەت .. پەنجەکانت .. چاوەکەت ..

چاوە پڕ وەیشووم و ڕەشەکەت .. چاوە پڕەکەت لە شەوانی ئەنگوستە چاو و تاوان .. پڕ لەشەڕ و ترس و تۆقین .. گوتم : وسبە ..ئافرەت .. ئەم چاوەم بۆ ئەبەد ڕۆیشت ئەو چاوە بەد و ترسناکەم توڕ هەڵدا .. بردییەوە .. بۆ خۆی بردەوە و نازانم بۆ کوێی فڕێدا.. بۆ هەتاهەتایە لەو چاوە نەعلەتییەوە خەلاس بووم .. ئیدی ساتێکی دیکەیە و لەبیرمەچێت کە من پیاوێك بووم دوو چاو و دوو گوێچکە و دە پەنجەم هەبوون .. بیرم ئەچێت وەك هەموو مرۆڤەکانی ئەم زەمینە ئەچوومە شەڕەکان و بە دوو دەست و دوو چاو و دوو گوێچکە شەڕم ئەکرد .. بیرم ئەچێت وەك هونەرمەندەکانی ئەم زەمینە بە دە پەنجە ڕەسمم ئەکرد .. ئیدی با.. بیرم بچێت .. من ڕقم لەو یادگارانەیە کە لەگەل چاو و دەست و پەنجەکانم هەن .. ڕقم لەو ساتانەیە کە ئەوانم بیردێتەوە .. نامەوێت گوڵێك بێت و بڵێت ئەوە بۆنی پەنجەکانت لەسەر پەلکەکانم دێت .. مەلێك بڵێت تیشکی چاوەکەت وا

لەسەر پەڕەیەکم .. نامەوێت .. ڕقم لەو زەمەنەی پێش ئێستای خۆمە .. و ڕقێکی سەیر هەموو جەستەمی داگرت هەر لەبنی بنەوە تا سەری سەرم .. گوتم : ئەی خوایە گیان .. هاوارم کرد .. ئەی سەروەری لەشی بۆگەنی من .. ئەی گەورەی دەماغی پیسی من .. وەرە و من لەگەل خۆتدا بە نیوی بکەوە .. من بکە نیوە ، وا خەریکە جەستەم هەموو ئەقیژێنیٚ .. نیوەی چەپەم لەگەل نیوەی ڕاستەم .. بە شەڕ دێن خەریك بوو جەستەم هەمووی دەرزی ئاژن ئەبوو .. لە ناوەوەم بەشی چەپەم ئەفیونی ئەکردە بەشی ڕاستەم .. بەشی ڕاستەشم تریاکی ئەناردە بەشی چەپەم .. بەشی چەپەم نەرم نەرم بۆوە .. وەك ئاونگی سەر پەڕەی گوڵێکی کلینساوی لێهات .. بەشی ڕاستەشم بووە بەرد و وەك ئاسنێکی ساردی لێهات .. بەشێکم بوو بە شەیتان و بەشێکم بوو بە فریشتە .. بەشێکم ئەگریا و بەشێکم پیٚ ئەکەنی .. بەشێکم هاواری کرد بڕۆ بەرەو جەهەنەم بەرەو دوورترین و قوڵترین چاڵی

ئاگر .. بەشەکەی دی لە وەلاّمدا گوتی : بڕۆ .. لەگەل کازێوەیەکدا بڕۆ کە تاوان قەبوول ناکات .. ئەوەی دی گوتی : بڕۆ هەی بەشی بەد .. هەی ژەهر و زریان .. لەم باخچانەدا تۆ پیر دەبیت و ناگەیتە هیچ .. تۆش بڕۆ ئەی عاتیفەی حەشیشە .. ئەی سۆزی بێهوودە .. ئەی چرای بیٚ رۆشنایی .. بڕۆ لەگەل درۆزن و هەژار و سواڵکەرەکاندا لە گەل بیٚ تاقەت و بیٚ کارەکاندا راکشیٚ .. راکشیٚ و خەمی تەرم و شەڕگەکان بکە ... بڕۆ و بڵیٚ نەفرەت لە شەڕ .. کە کەس گوێت لیٚ ناگرێت .. بڕۆ تۆ هیواکانت لێرەدا شین نابن .. تۆ خاکێکی دیت ئەوێت بۆ خەونە جەهنەمییەکانت .. ئاسۆیەکی دی بۆ فڕینە خەردەلی و بارانی کیمیاکانت .. ئەم هەیوانە پر رێحانانە بە کەلکی تۆوە نایێن ... تۆ دەست نادەیت کچەکەت بخەیتە باوەشتەوە و لە وێوە دەنگی ریکۆردەرەکە بەرز کاتەوە .. وەك زریکەی تۆفانێك .. گۆرانیبێژەکە بە خۆی و کۆمەڵێك دەف و کەمانچە و یەك باغ

پەنجەی هەڵوەریو هاتەوە و هاواری کرد .. لەگەل مندا بقیژێنە .. لەگەل مندا هاوار بکە ..کەمانچەیەکم لە خەمی مناڵەکەی باخچەی ساوایاندا وەزگی دا .. دەفێکم بۆ شەهیدەکەی ناو رووباری خوێندا کە بۆ سەیری هەتاو ئەگریا و ئەپاڕایەوە .. مرد ، خەریکە ئەو رووباری خوێنە ئەبێتە تاعون و هەموو کەمانچە و دەفەکانم وەك دەرد تووشی ئەو مردنە ئەبن ..، تۆ سەیری ئەو پەنجە شەهیدانە .. ئەو هەموو باغە سیس و گوڵە زیزانە..، تۆ سەیری ئەو پایزە تورەیە ، خەریکە هاوین ئەکا بە سینەما و لەناو عارەقەی گەرمی خۆیدا ئەیخنکێنیٚ ..، تۆ سەیری ئەم تۆفان و ئەو ئاوە گەرمانەی هاوین .. کە پایز گاڵتەیان پیٚ ئەکات و ئەڵێت ئەوانە نەخشی ئەو سحرەن کە لە ساتێکی نادیاریی مندا بە ئاسۆکانی دونیای ئەبەخشیٚ و هاوین وەك مناڵێکی هەرزەکار ئەیاندزێت..، هاوین بەو هەموو گەرمایی و تەموزو رۆژەکانی گەلاوێژیی چاوەکانی و هەتاوی

رژاوی ئەنییەی .. کەچی هێشتانەکە لەوە گچکەترە دارێکی من بۆی بشنێتەوە .. ساتێك لە زەمەنەکانی من گۆرانییەکی بۆ بڵێت ..،جێیەك لە سینەم خۆی بۆ بکاتەوە .. بیٚ ئەوەی خۆم بە منەتباری ئەو بزانم .. بیٚ ئەوەی حساب بۆ ئەوە بکەم کە لە دوای ئەودا من دێمە سەر سفرەی زەمەن و لە دەروازەکانی شوێندا دێمە ژوور ئەتوانم تفی لێبکەم .. تفێك کە هەر گیز .. ئەو ناتوانێت لە وەرزەکانی دیکە بکات .. کە هەرگیز ئەو ناتوانێت سەری خۆشی لە بەرامبەر بەرز کاتەوە .. هاوین وەرزێکە کە خۆی دائەپۆشیٚ کەس حەزی لێناکات .. کە خۆشی رووت ئەکاتەوە بۆنی ئارەقەیەکی بۆگەنی لێدێت ، بەیانییانی ناخۆشن بۆ خەوتن .. نیوەڕۆیانی بۆ ئیسڕاحەت .. شەوانی بۆ پیاسە و رابواردن .. هاوین وەرزێکە لە خیانەتی زەمەن لە زەوی .. خیانەتی شوێنیشە لە گەردوون ..!

هاوینی بەد .. من خۆم ئەکوژم و تۆ دەستێکت نەخەیتە گەرمی ئاگرەکەمەوە .. پەنجەیەکت نەخەیتە فوارەی خوێنمەوە ..، هەقت نەبێت رەگەکانم لە ناخی زەویدا تا کامە وەرز قیژەیان درێژ ئەبێتەوە .. دارە بریندارەکانم تا ئەمرن کەس نەیانگەیەنێتە خەستەخانەی چ زەمەنێك و لە نەخۆشخانەی هیچ شەوێکدا نەیانخەوێنن و لە لای چ تیمارخانەیەکیشدا دەرمان مەکەن بە تەرمی سووتاوی باخچە رووتەکانم .. نەهێڵن بەهار بە کچە بیٚ شەرمەکانی باخەکانی شاتوو .. بڵێت : بمشۆن .. نەهێڵن کوڕە سەرما بابردەڵەکانی شەقامەکانی زستان لەسەر دارەبازە بەفر گرتووەکاندا هەڵمگرن .. لێمگەڕێن با هاوین و زستان و بەهار و زەمەنی بیٚ هەتکی ئەو وەرزانە پەنجە نەخەنە جەستەمەوە .. گوڵاو نەکەن بەسەر تەرمی راکشاوی مندا لە شوێنە گشتی و تایبەتییەکاندا ..،

منیش ئەچم تێکەڵ بەو رووباری خوێنە ئەبم .. تێکەڵی ئەبم و ئەیکەم بە تۆفانی مەرگ و کەرنەڤاڵی کوشتن ..، لەوێش ئەی وەرزە بەدەکان ..

وەرزە پڕ وەیشوومە و تاوان و شەڕەکان .. لەوێشدا تێکەڵم مەبن .. من زەمەنی خۆم لە دەمەکانی ئێوە جیاکردەوە و نەمویست درێژکراوە و تەواوکەری یەك زەمەن بین .. نەمویست درێژکراوەی یەك زەمین و خاك بین .، هاوین ئەی وەرزی شەڕ و مارو دووپشك و زیندەوەرە چ نەزان و پڕ غەریزەکانی کوشتن و شەڕ ..، بەهار ئەی بێ حەیاترین وەرز و پۆشتەترین سۆزانی .. زستان ئەی وەرزی تۆفانەکانی بەفر و خیانەتی سروشت .. لێم گەڕێن .. من ماڵێکم ئەوێت سەر نەکا بە وەیشوومەکانی ئێوەدا .. پۆستەی باران و گەرما و بریق و باق و هەتاو و فێنکایی و سەرمای ئێوە نەزانێت .. لە هەواڵی گۆڤەندو شایی و فیستەڤاڵەکانی رەنگ و ئاهەنگەکانی دەنگتان نەپرسێت ..،

من لەو ئانەدا کە حەزم ئەکرد .. لە نیوەوە ڕا .. لە ناوەندەوە ببمە دوو بەش .. راست و چەپەم لێك جیابینەوە .. بەلاّم نەئەکرا .. هەر دوو لایەکانم هەستم کرد سڕ بووینە .. وەك ئەوەی هەردوو لا ئەفیونکراو بن .. لەوە ئەچوو بەشەکانم لەگەڵ یەکدیدا ماڵی خۆیان بکەن .. وەك چۆن پایزە توڕەکە ماڵی خۆی لەزەمەن و شوێنی وەرزەکانی دیکە کردبوو ..،

من لە بیرم ئەچوو .. بەلاّم گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکە .. هاواری کردەوە .. نازانم بۆ هاواری ئەکرد .. وام هەست ئەکرد کە نزیکە لێم .. بەلاّم ئەو هەر هاواری ئەکرد و بە گریان و قیژەوە قسەی ئەکرد و ئەینالاّند .. کەمانچەیەك ئاوزینگی ئەدا .. هەناسەی بە زەحمەت ئەهات و ئەچوو .. گۆرانیبێژەکە کەمانچەکەی خستبووە سەردەست و تێلەکانی کەمانچەکەی هەندێکییان پسابوون و بەسەر لەشی کەمانچەکە و دەستی گۆرانیبێژدا هاتبوونە خوار .. کەمانچەکە بێ دەنگ وەك تەرم .. راکشابوو .. چاوەکانی خستبوونە سەر یەك و سڕ ببوو .. بەلاّم هێشتا هەناسەیەك وەك لەرینەوەی گەلاّیەکی پایزی لەسەر زەویدا ئەجولاّیەوە . بایەك بە فێنکی لە

تێلـە پساوەکانی ئەدا و زۆر بەهێمنی ئەیهەژاندەوە .. بێ ئەوەی هیچ دەنگییان لێبێت .. وەك چۆن من هەموو جار کچەکەمم لە باوەش ئەکردو دەنگی ریکۆردەرەکەی بەرز ئەکردەوە .. گۆرانیبێژەکەش بەو سۆز و میهرەبانییەوە کەمانەکەی هەڵگرتبوو .. کە زۆرم لێ نزیك بۆوە ..تەماشای چاوەکانیم کردو بینیم پڕن لە فرمێسك .. چاوەکانی وەکو باخچەیەکی تەڕ وابوون .. پربوون لە ریحان و نازنازی تەڕ .. تەڕ .. رەشکێنەی چاوەکانی لە دارستانێك ئەچوون پڕ بێت لە تاریکی .. تاریکییەك کە بگرییێت .. لەخۆی بدات و وەك تارماییەك لەناو ئازاردا بێت و بچێت .. روحی جەنگەڵێکی تاریك لەو رەشێنانەدا ئەبریسکانەوە .. چەرمی پڵنگێکی رەشی بریندار بریقەی ئەدا کە لە سەرەمەرگ دا بێت .. ئای لەو خەمە قوڵەی ناو رەشکێنەی چاوە قوڵەکانی و دوورەکانی .. فرمێسکێك لەو قوڵاییەوە هات .. سەرەتا وەك ئاوێکی رەش ،، دوایی کەنزیك بۆوە سەوز بوو .. کە لە گلێنەی دەرکەوت سوور هەڵگەڕا و کە لە چاویشی کەوتە خوار زەردبوو .. کە بەسەر تەختە قاوەییەکەی کەمانچەکە کەوت وەك شیر .. سپی بوو .. و کەمانچەکە دوا هەناسەی دا ..،

کچێکی جحێڵ .. لەناو رووباری خوێنەکەدا گەیشتە لامان .. و گووتی مەگری ئەی گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکە مەگری .. ئەم باخانە هێشتانەکە لە ئاواز و مۆسیقا ناگەن .. ئەم دار بەڕوو و چنار و سپیندارانە هێشتا ماویانە خۆیان بە مۆسیقا گەورە کەن .. ئێمە لە زەمەنی وەرزەکانی وەیشوومە داین ..، لە وێستگەکانی شوێنی شەڕ و کوشتارگە داین..، خودایە.. من بۆ تەمەنێکی بەر هەتاو بارانەکانی تۆ ناپارێمەوە .. بۆ تەمەنێکی دیکەی .. وەرزەکانت ناگریم ..، من مەراقی ئەو ژیانەم نیم .. کە تۆ پێت بەخشیم .. کە بێ ئازادی و بێ ویست و حەز پێت بەخشیم..، من هەرگیز شەیدای ئەو ژیانە نەبووم بە شووشە شروبە موخەدەرەکان و سەرخۆشییەوە

شیرن بێت ..، بێ منەت بووم لەو کوشتنەی کە شیرنتر بوو لەو مەرگەی لە ماڵەکەمدا ئابلۆقەی ئەدام ..، بێ باك بووم لەو شەڕەی کە زۆر مرۆڤانەتر بوو لەو ئاشتییەی لەشی دەرزی ئاژن ئەکردم و هەموو رۆژێك دەیان خەونی ئەسووتاندم .. هەموو شەوێك دەیان برینی لە جەستەمدا ئەکولاندنەوە .. من لەو دەلاقانەوە سەیری ژیانم ئەکرد .. کە گوڵی تیابوو .. ئەوان پیاوە پڕ شەرم و ناموسەکان .. لەو دەلاقانەوە بۆنی کوشتنییان ئەکرد .. من لە هەیوانێکی گچکەوە .. بەقەد چۆلەکەیەك تیایدا ئەفڕیم و لەوێوە سەیری ئازادیم ئەکرد .. بەڵام پیاوە ماقوولەکانی ماڵەکەم لەو هەیوانەدا ئاسۆی کوشتارگەیەکییان بەدی ئەکرد ..،

من لەبەر پەنجەرەیەکدا بۆم هەبوو سەیری ژیان و باخچە و کوڕەکان بکەم .. یەکتاقە پەنچەرە کە گوڵدانێکی پڕ خەونم تیادا چاندبوو .. گوڵدانێکی تژی میهرو خۆشەویستیم تیادا بە خێو ئەکرد .. کەچی پیاوەکانم .. هەرگیز حەزیان لە خەونی درێژ و عومری درێژی کچەکان نەبوو .. هەمیشە کوشتەی ئەو شەوانە بوون کە بۆنی خوێن و تاریکییەکی کوشندەیان لێ ئەهات .. ئەو شەوانەی .. ئەگەنە نیوەی عومریان و لەوێدا وا ئەزانی زەمەن بۆ کۆتا ئەوەستێ .. لەوێدا .. لەناو پێخەفەکەدا .. بە بێ دەنگی دەرت ئەهێنن و .. ئەبینی وا باوکت و براکانت و مامەکانت و ئامۆزاکانت و خاڵۆکانت و دایکە قوڕ بەسەرەکەشت کە ئەگریێ .. ئەوان پەلت ئەگرن و ئەتبەن .. نایەڵن یەك زریکە یان چریکەت لەزار بێتە دەر نایەڵن چاوێك بە بەر پەنجەرەکەدا بگێڕیت .. پێم گووتن لێگەڕێن با ئەو گوڵدانە لەگەڵ خۆم بێنم .. لێگەڕێن کەدە رێحانێکی گوڵدانەکە بێنم .. لێگەڕێن بۆ دواجار بۆنی بکەم .. لێگەڕێن بەس جارێك تەماشای بکەم هەر لە دوورەوە تەماشای بکەم ...

کەس وەڵامم ناداتەوە .. ئەمخەنە تۆمبێلەکە و لە دووری شار و گوندەکانەوە .. لەدەرەوەی زەمەن و شوێنەکاندا .. لەو نیوە شەوە زەمەن وەستاوەدا .. لەو جێیە بێ زەوی و زەمینەدا .. شتەکان زۆر بەپەلەوە ئەنجام ئەدرێن .. یان رەنگە درەنگیش بێت..، لێ .. تۆ وا هەست ئەکەیت زوو ئەکرێت .. دوایی ئەکەویە بۆشاییەکەوە .. بە جدی هەست بەهیچ کاتێك و شتێك ناکەیت..، تۆ ئەبینیت ئەوە باوك و براکەت و ئامۆزاکانت دەستیان گرتوویت و ئەتبەن .. وەك ئەوەی لە فەراغەکە بێیتە دەر هەست ئەکەیت بۆ کوشتن ئەتبەن و ئەتوێت بگرییێیت .. هاوارێك بکەیت ..، بڵێیت مەمکوژن .. چیم نەکردووە .. من کچم .. کەس دەستی لێنەداوم .. دوایی کە ملت رائەتەکێنن ئەم هزرانەت پەرشوبلاو ئەبنەوە دیسانەوە ئەکەویەوە فەراغێکی خنکێنەرەوە.. زەمەن و شوێن دەوریان لە دەماغتدا نامێنێ .. نزانی کێشت هەیە یان نا .. لە دەستی براکان و ئامۆزاکانتدا سووك ئەبیت ..، کەچی هەست ئەکەیت گرانیشیت .. ئەوان زۆر بە ئاسانی هەڵت ئەگرن و لەسەر بەردەکاندا پێت باز ئەدەن .. لە پڕ دەنگی خوڕەی رووبارێکی بچکولانەت دێتە بەر گوێ .. ئەترسیت .. ئەمجارەیان هەست بە پێیەکانت نامێنێت .. نزانی پێیەکانت چ لێبکەیت .. دوایی ئەزانی پێیەکانت زۆر قورس بووینە .. ناتوانیت لە دوای خۆتدا رایانکێشی .. پێت هەڵناگیرێن .. کەس دەنگ ناکات ئەکەویەوە ترسێکی کوشندە و حەزی گریان و هاوار و پاڕانەوە پەیا ئەبنەوە .. دەنگت ئەخنکێ.. لە پڕ ئەکەویتە سەر پارچە زەوییەکی رەقەلانەوە .. پشتت لە باوك و برا و مام و ئامۆزا و خاڵۆکانتە .. هەست بە هیچ ئێشێکەوە ناکەیت .. هەست بە لەشت ناکەیت .. ناتەوێ ئاوڕ بۆ دواوە بدەیتەوە گوێچکەکانت هیچ نابیستن .. هیچ دەنگێك .. نرکەیەك .. نایەت .. دەماغت ئەکەوێتە بۆشاییەکی سەیرەوە .. هەستی زەمەن و جێ بزر ئەبنەوە .. ئاگات لێ نیە لە پشتەوەت چی رووئەدات ..

باوکت .. برات ئامۆزا و مام و خاڵۆکانت چی ئەکەن .. لەش ئەبێتە شتێکی سەیر و غەریب .. لەو چرکەساتەدا گریان و پێکەنین و ترس و ئازایەتی و هیچ بابەتێکی دی لە لای من نەمان .. تەپەیەکی زۆر بچووك هات و هەستم کرد سەرم کەوتە کۆشم و دونیا تەواو تاریك بوو .. گوێم لە هیچ تەپەی دی .. دەنگی دی نەبوونەوە .. وام هەست کرد وا چوومەوە ناو جێگەکەم و گەرم بوومەوە .. تا ئەو رووباری خوێنە بە ئاگای هێنامەوە و زانیم من کوژراوم .. پێکەنیم و سەیرم کرد سێ کەدە نێرگزی سوور لە جێی ئەو سێ گولانەدا رواون کە براکەم لێی دابووم .. وتم ئای چەند خۆشە ئازادی ..؟!

چەند خۆشە مەرگی ئاسوودەی من .. چەند خۆشە ئەو راکشانە سەرمەدییەی من .. ئای لە خۆم لە نێو ئەو خوێن و نێرگزانەدا .. ئای لەخۆم لە نێو ئەو سێ قەوان و ساچمانەی سەرمدا .. ئای لەو مەرگە بەخشندەیە .. کە ساتێکی هەموو وەرزەکانی ژیان دێنێ .. ئای لەو مەرگە میهرەبانە .. کە هەموو لاوانەوەکانی دایك و عاتیفەکانی باوك ئەهێنێ .. بەختەوەر خۆم .. شادمان خۆم لەو مەرگە پڕ نێرگز و هەڵاڵەدا .. لەم مەرگە پڕ ژیان و ئاسوودەدا .. من هەندە شەیدای ئەو کوڕە چاو جوانەش نەبووم کە تەنیا یەکجار لەبەر پەنجەرەکەدا ماچێکی بۆ هاوێشتم .. و منیش بەسەری پەنچەیەکمەوە ماچێکم بۆی هاوێشتەوە ..هێندە شەیدای ئەو گوڵدانەش نەبووم کە خەونەکانم بۆ ئەو ئەگێڕانەوە و باسی خەیاڵەکانی خۆم بۆ ئەکرد .. هەندەی کوشتەی ئەو کوشتنەی خۆمم ..،

مەگری ئەی گۆرانیبێژە دەنگخۆشەکە .. مەگری ..، کێ ناڵێ ئێستا ئەو کەمانچەیە لە باوەشی مەرگدا ئاسوودەتر نیە لە باوەشی تۆدا ..؟ کێ ئەزانێ بە تەلە پساوەکانی پڕ ئاوازتر نیە لەوەی تەلەکانی گرێدراوبن .. کێ ئەزانی پێشبینی وێنە و رەنگەکانی مەرگ بکات .. رەنگە ئەم مەرگە دەجار پڕ مۆسیقا تر

**بێت لە ژیانی کەمانجە ..، ڕەنگە ئەم مەرگە بتوانێت مانایەك بەو عەزفانەوە ببەخشێت کە نەکران ..، بەو ئاهەنگانەوە کە ساز نەدران ، لێگەڕێ با ئەو کەمانچەیە خەون بە مەرگێکی ئاسوودەوە ببینێ .. ، خەون بە ئاهەنگی باخچەیەکەوە ببینێت کە خۆی بۆ هەتاو ئەکاتە بووك ..، خەون بە مەراسیمی گواستنەوەی شۆخترین چنار بۆ جوانترین شاتانی ئەم وەرزە..،**

**لێگەڕێ .. با لەگەل تەرمە ئاسوودەکانی ئەم کاروانی خوێنە رژاوەدا .. ڕێ بکات ..، لێگەڕێ .. با لە گەل ئێمەدا فێرە ئاوازی نوێ و ژەنینی جوانتری مەرگەکان بێت ..، لێرەدا مردنەکان ئاهەنگیان بۆ ئەگێڕدرێت .. ئاهەنگی قەشەنگ و شادمانانە .. ئێمە ئاوازی جەنائزی بۆ زیندووەکان بەجێ دێڵین ..، ئەوان تامی لێ وەرئەگرن .. ئەوان با لەبەر ئەو ئاوازە غەمگینانەدا بگرییێن ..، با بیر لە تاوانەکانی خۆیان بکەنەوە و سەیری دەموچاوی مرۆڤە مردووەکان بکەن**

**و ئەو مۆسیقایە هەستەکانیان شل بکات و گیانیان بە خوڕتر بکات..، با بگرین ئەوسەرکردانەی زیرەك بوون لە بە کوشتدانی کەناری و کوێر کردنەوەی باخچەکان و تەقاندنەوەی پردەکانی نێوان مامزەکان و باخچەی هەنار .. بابگرییێن ئەو مامۆستا پیرانەی زیرەك بوون لە فتکردنی خەونەکان و بڕینەوەی پەلکەکانی ئەو ڕێحانەی کوڕێك لەناو دەفتەرێکی ئەنان بۆ کچە جوانێکی ناسك و نازدار..،**

**با بگرییێن ئەو پیرە ژنانەی بە ددانە ڕەشەکانیانەوە ، لاسکی ئەو گوڵانەیان ئەقرتاند کە کچە جحێلەکان ئەیانخستنە ناو کتێبەکان و وشکیان ئەکردن..، با بگرییێن ئەو باخەوانانەی رقیان لە جوانترین گوڵ و ناسکترین ڕێحان ئەبۆوە کە ژنەکانییان ئەیاندا لەیەخە و پەرچەمیاندا ..، با بگرییێن ئەوشاعیرانەی بە درۆ شعریان بۆ وڵات ریز ئەکرد و ئەشتۆقین کە زمانزانێك فشەی بە شعرەکانی ئەوانەوە ئەکرد وەك چۆن پایزەکە فشەی بە وەرزەکانەوە ئەهات..، ڕێ بدەن ..**

با بڕوا ئەم رووباری خوێنە بێ دەسەڵاتە با بڕوات..، با بڕوات ئەم رووبارە تژی تفەنگە و بێ پەنجەیەکی زیندوو..، با بڕوا ئەم رووبارە بێ ئومێدە .. با بڕوات کە پڕە لە نارنجۆك و خاڵییە لە کەڵبەیەکی هار، با بڕوا ئەم رووبارە بێ تاقەتە با بڕوات کە پڕە لە کەللە سەر و بێ نەخشەیەکی دیار..،

بابڕوات وەك چۆن با شێواوەکان لە دەشتەکاندا رێ ئەکەن .. با بڕوات وەك چۆن مارێکی سەرخۆش لە ناو کێڵگەی گەنمدا ئەڕوات ..، با بڕوات وەك چۆن مێروولەیەکی یاخی بەرەو دوورترین خاڵ لەشاری مێرووستانان رائەکات .. با وا بڕوات..،

با بڕوات و بڵێت خەزێنەکانی شێتی و یەقینی شەڕەکانی مرۆڤ وا لەناو ئەم خوێنە لینجەدا .. گۆرانیبێژەکە .. هاواری کرد .. بۆ لەگەل مندا ناقیژێنی .. بۆ لەگەل مندا ناپاڕێیتەوە .. بیرم چووبوو .. بۆچی هاوار بکەم .. بۆ بقیژێنم .. ویستم پێی بڵێم بۆ هاوار بکەم و بقیژێنم ..؟ ئەترسم .. لەگەل قیژەکەمدا گوڵەکان بترسێن .. ئەستێرەکان زەندقییان بچێت .. کچەکەم خەبەری بێتەوە .. من شتەکانم لە بیر ئەچوونەوە .. ویستم پرسیارەکان بکەم .. لێ هەستم کرد.. دەنگم نایەت ..؟! زانیم دەنگم نەماوە .. هەر یەکسەر دوای ئەو هەستە .. لەسەرمدا بریسکەیەك .. شۆقێك هەڵسا .. رووناکییەك لە چاوی چەپەمدا لە ناو رەشکێنەکەمدا .. بریقەی هات ..، گووتم دەنگم بۆ چییە ؟ گەرووم وەك ئەوەی بڵێی وەك لۆکە وەك زمانی مار نەرم بووە ئاوا نەرم بوو .. هەستم کرد لە ناوەوەدا وەك شەعرولبەنات ئەتوێتەوە .. توانەوەیەکی زۆر غەریب و خۆش، لەزەتێکی سەیرو سەمەرەی بەجەستە ئەدام .. لە ناخمدا دەنگێك وەك زەنگوڵ ئەزرنگایەوە و ئەیگوووت بێ دەنگی چەند خۆشە ..؟! هەستم کرد لە شتێکی قورس و بەدەوە رزگارم بووە .. پێم سەیربوو .. پرسیارم کرد خودایە بۆچی بەلاڵی منت نەدەهێنایە سەر دونیا کەلاڵیەتی ئاوا ئاسوودەیە ؟!

لەو ساتەدا حەسوودیم بە هەموو لاڵەکانی ئەم کەونەدا هاتەوە .. خۆزگەی ئەوەم هەڵکێشا کە ئەبوایە هەر لەسەرەتادا وەکو ئەوان بام .. وەك ئەوان بەختەوەر بوومایە ..، ئەگەر وەکو ئەوان بام بۆچی ئەو هەموو تەمەنە پرسیاری ئاسوودەگی و ئارامیم ئەکرد .. بۆچی ئەو هەموو شەونخوونی و گومان و ترسانەم ئەکرد .. لێ نەشمتوانی بەختەوەریم بشارمەوە بەوەی هێشتا تەمەنێکی دوور و درێژی ئاسوودەم لەبەر ماوە بە لاڵییەتی و بەختەوەرییەوە بەسەری بەم .. دەنگەکەم بۆ کوێ چوو.. هەر بۆ هەوەست ئەم پرسیارەم کرد .. گووتم رەنگە ئەویش بۆ شوێنێك رۆیشتبێ .. رەنگە چووبێتە بازاڕی کەنارییەکان ؟! یان شانۆی شالوورەکان کە هەموو جار نیوەی شەوان لەناو تانۆکەکانی باخچەکاندا دایئەنێن و بەو نیوە شەوانە خۆشترین ئاوازی خۆیان ئەژەنن ..؟

دەنگی ژنەکەم وەك تارمایی هات و بە توندی لەبن گوێچکەمەوە گووتی .. پیاوەکەم .. پیاوە جوان و توڕەکەم .. ئەی میهرەبان و تووشەکەم .. کوا چیت بەسەر هات ؟! بۆ سۆراخی کچەکەت ناکەیت .. بۆ سۆراخی گوێچکە و چاو و پەنجە و دەنگت ناکەیت .. ئەی پیاوە رەنگ سەوز و تەڕەکەم .. کوان ئەو برژانگە درێژانەی ژێر ئەبرۆی راستە و برۆ گرژەکەت ..؟ بۆچی خەمێکییان لێ ناخۆیت ..؟

من شەلاڵی ئارەقەیەك بووم .. کە خۆشی لێ ئەڕژا ..خۆشییەك کە هەموو شتەکانی لەبەر چاوومدا جوان ئەکرد .. من هیچم بیر نەمابوو .. لەوە ئەچوو بەرەو پنتێکەوە بچم هیچی دیکەش فێرنەبم ..، بکەومە چاڵێکەوە کە تەنیا هەست بە خۆشییەکی غەریب بکەم .. خۆشییەك کە بۆ یەکەمجار وام لێبکات .. لێبگەڕێم ژنەکەم خەنە لە پرچی بدات .. یەکسەر گووتم .. بڕۆ ئەی جوانترین ژن و مەلعونترین ژن .. ئەی بەشۆقتر و تاریکترین ژن .. ئەی عاشقترین و

**جەلادترین ژن .. ئەی نەرمتر و دڵرەقترین ژن .. بڕۆ ئەمشەو خەستترین خەنە لە پرچت بدە .. بڕۆ ئەی مەکربازی حەیابازی عەشقبازی هەوسبازی نازەنین .. بڕۆ ئەی ژنی شۆخ .. بڕۆ وەك با بڕۆ پڕ بە لە جووڵە .. وەك رووبار بڕۆ تژی بە لە هاژە .. وەك نەسیم بڕۆ پڕ بە لە ناز .. وەکو شەماڵ بڕۆ غەرق بە لە کبریا ...**

**هاواری کرد .. ئەی پیاوەکە بۆ دەنگ ناکەیت و ئەو هەموو شەهوەتە چییە لە چاوت ئەڕژێت ؟ پێکەنینم هات و بیرم کەوتەوە ئەو نازانێت من لە گرێیەکانی دەنگەوە ئازادم .. ئەو نازانێت ئیدی ئێستا من چاوەکەم .. تاقە چاوەکەم دەلیلی زەوق و سەفای منە .. خەریتەی میزاج و رووناکی و تاریکی و گەشتە خۆش و نەخۆشەکانی منە .. بە چاوەکانم پێم گووت .. منم پیاوی ئازاد... منم ئەتوانم هەموو سیفەتە هاودژەکانی ژنانەت پیێ ببەخشم .. لە جوانی و لە ناشیرینی .. لە نەرمی و سفتوسۆڵی .. لەگەل لاوازی و رەقوتەقیت .. ئەتوانم بەرزت کەمەوە بۆ کەشکەلانی ئەستێرە ترسنۆکەکان و ئەشتوانم بتبەم لە سردابی دوورترینماڵی رەگە قووڵەکانی تووێکی هەزار ساڵەوە زیندانیت کەم .. ئەتوانم لە بنی پێتەوە تا پرچت ماچ کەم و بتلێسمەوە و ئەشتوانم هەموو جەستەت بکەمە سووتماك و تف .. من ئەو پیاوەم بەهەشت لە لەپێکم و جەهەنەم لە لەپێکی دیکەم دایە .. ئەتوانم وەك کەدە رێحانێك بە بچووکترین نینۆکم بتقرتێنم و ئەشتوانم بە پێچەوانەوە لەبەر پێیەکاندا بەچۆك دابێم و هیوای ماچێکت .. ماچێکی ئەو لێوە گۆشتنانەت .. ئەو پەنچە میهرەبانەت بکەمە گەورەترین ئومێد و حەساسترین پنتی چارەنووسم .. من لەو ساتەدا .. ئەی ئافرەت سەیرترین پیاوی دونیام .. زیرەکترین پیاوی دنیام ..کەیفخۆشترین پیاوی دنیام .. ئازادترین پیاوی دنیام ..**

**گۆرانیبێژەکە هاواری کردەوە ..، خودایە من ئازادیم ناوێت .. من زیرەکیم ناوێت .. من دەنگی کەمانچە و تەپەی ئەم دەفەم ئەوێت ..، من سەربەستی**

باخە بیٚ سمیٚڵەکان و .. ئازادی باغە ریش دریٚژەکان و سەرخۆبوونی رووبارەکانی خویٚن و شەڕم ناویٚت .. من لە رۆحی ئازادی خۆمەوە بۆ گۆرانی و سەما ئەپەڕمەوە .. من لە گۆرانییەکانمەوە بەرەو هەڵپەرکیٚ و خوا ئەبمەوە ئەو دەف و ئەو کەمانچەیە زنجیرەکانی دەستی من ئەپسیٚنن .. ئەو دەف و ئەو کەمانچەیە گریٚیەکانی گەرووم ئەکەنەوە .. حورمەت بەدەنگ و وشەکانم ئەدەنەوە .. من نامەویٚت لەو باغە جوان و رازاوانەدا گۆرانی بڵیٚم ..،من شەیدای پیسترین باخچەی ئەو بیٚشەلانەم .. من کوشتەی دڕندەترین ئادەمیزادم، بیٚت .. و لە ویٚرانەترین شەقامدا گویٚم لیٚبگریٚت .. من کوشتەی بیٚ شەڕەفترین پیاوم بیٚت لە مەشبوهترین ئوتیٚلدا لەگەل ئاوازەکانم تیٚکەڵ بیٚت ..،من مەراقم .. سۆزانیترین و وەحشیترین جەستە .. بیٚت و لە وەحشەتترین .. سەحرادا گویٚم بۆ هەڵخات ..، من باوەکوشتەی ئەو خونچە دڕندەم کە لەشەڕانیترین بەیانیدا دەمی

ئەکاتەوە .. بیٚت .. لەبەر پەنجەرەی پەنجەکانی مندا شەڕ لەگەل عەزفەکەم بکات..، من بەد گومانترین شەڕکەرم خۆشەویٚ کە بیٚت لەگەل چریکەکانی مندا سەما بکات..، من گۆرانییەکانم بۆ تۆن ..، ئەی بارانی غەزەب و زریانی توڕەبوون ..، بۆ تۆن ئەی خوای فەنابوون و شەیتانی شەڕ ..، بۆ تۆن ئەی هەتاوی پۆخڵەوات و فەسادترین گوڵ ..، بۆ تۆن ئەی بۆگەنیترین ئەرخەوان و لاسارترین کەو ..، بۆ تۆن ئەی دەلالی کوشتن و سمساری تلیاك ..، بۆ تۆن کە بۆنی ئەفیونت لیٚ هەڵئەستیٚ .. بۆ تۆن کە بۆنی سۆزانییەکان وەك گوڵەباغ لە باخەڵتەوە هەڵئەفڕیٚت .. بۆ تۆن ئەی پیاوی شەریف .. بۆ تۆن کە بۆنی کوژانەوەی ئەستیٚرەکانت لە سینەوە دیٚت ..، بۆ تۆن کە هەلاهەلابوونی کریستاڵەکانی عەشق لە ئەنیەتەوە ئەباریٚت .. بۆ تۆن ئەی خۆشەویسترین پیاوی ژنە زیزەکان .. ئەی دڵرەقترین سەرکردەی شەڕەکان .. ئەی یەقینترین مامۆستا لە حەقیقەت .. کوشتەترین

هەواڵ لەراستی .. دیارترین بیردۆز لە رەخنەی وڵات .. رونترین كانی لە ئەدەبیاتی باخچە .. بێ گومانترین خەیاڵ لە نیشتمان .. ئەی جوانترین ساحێبی زەمین .. ئەی خودانی ئێمە و ژنەكانمان ئەی دەوڵەمەندترین قەرزدار .. تۆ خەیاڵكە .. كە باخچەكان چاویلكەیەكی سەوزن بە قیاسی چاوەكانی تۆ ..، تۆ خەیاڵكە نیشتمان لانەی پەڕەسێلكەیەكە تەنیا تۆ مافی تێكدانیت هەیە .. تۆ خەیاڵكە خۆشەویستی گوستیلەیەكە بە قیاسی پەنچەی شایەتمانی تۆ .. تۆ خەیاڵكە ئەم بازاڕە .. هەیوانێكی سەماخانەی خۆتە و كام كچ جوانە .. كام ژن تەڕە .. بۆ تۆ ... من گۆرانییەكانم بۆ تۆ .. عەزفەكانم بۆ تۆ .. وشەكانم بۆ تۆ تا پێت بڵێم ... مرۆڤ چەند توڕەهاتە ..؟! مرۆڤ چەند بێ تەبیعاتە ..؟!

ژنەكەم نزانێت .. ئێستا من پێم وایە .. ئەو گۆرانیبێژە فێی گرتووە .. ئەو وا ئەزانێ ئەم لەحزەیە گۆرانیبێژەكە راست ئەكات و حەقیقەتێكی لەم ساتەدا دركاند..، كە رەنگە كۆتر و كەناری و كەو و سوێسكەو كەروێشك و رێوی و گورگ و توورگ و پڵنگێك و شێرێكیش نەوێرن بیدركێنن ..؟ وا ئەزانێت .. باخچەكان لەم پەیڤانەی گۆرانیبێژ شەرم ئەكەن .. یان رووبارەكان رەنگە بخنكێن ..؟ یان سەحرایەك لە پڕمەی گریان بدا و وەنەوشەیەك خۆی بكوژێت .. گوڵەباغێك خۆی فڕێداتە باخەڵی شەنگەبییەك و هاوار بكات رەحمەت .. رەحمەت .. خوای باخەكان رەحمەت ..، یان پاسارییەك خۆی بكا بە ماڵەكەیدا و هاوار بكات خوایە .. شەڕەف .. شەڕەف ..، یان بازێكی چاو تیژ لەگەل تێشكە برسییەكانی دەست بەرزكاتەوە و بڵێت سۆز .. سۆز ..، یان پڵنگێك دوعای ئەڤینداری .. بكات و هاوار بكات .. خۆشەویستی .. خۆشەویستی ..، یان شێرێك بنەڕێنێت .. گومان ..گومان ..، یان نیسانۆكێك دەستە سوورەكانی پانكاتەوە و هیچی بۆ نەیەت و بڵێت .. تف .. تف ..!!

نەخێر کەسیان واناکات ، بەرەواژی ئەمە..
ڕێوییەك ئەڵێت ئەمە فێڵی عەقڵە .. لە جەستە .. هاواری ئەم سۆزانییە ..، ئەوە حیلەی چاوە .. لە دڵ.. نرکەی ئەم شەهیدە..، ئەمە مەکری ئازارە .. لە برین .. ناڵینی ئەم منداڵە هەتیمە ..، ئەمە فێڵی ڕۆیشتنە .. لە پێیەکان .. هەنگاوەکانی ئەم شاعیرە ..، ئەمە فێڵی مردنە لە ژیان خەباتی نەتەوەی گوڵ ..، ئەمە فێڵی ژیانە لە وجود .. دروشمەکانی ئەم شۆڕشە ...

ئیدی باوەڕ مەکەن ستەم لە باخچەکاندا مابێت .. غەدرێك لە هەتاو بکرێت ..، ڕێگەیەك لە ڕووبارەکان بگیرێت ..، کەنارییەکان لە بازرگانیکردن لەگەڵ پشیلەکاندا ئازادن .. قومرییەکان ئەتوانن بێ پسوولە و کاغەزێکی گوڵگوڵی بە باخەکاندا گوزەر بکەن و لە ئاسۆکانەوە بچنە دەر .. پڵنگەکان ئەتوانن لە بن سێبەری ڕەشترین و تاریکترین جەنگەڵدا دانیشن .. هیچ پەپولەیەك ڕێی لێنەگیراوە بۆ کڕینی جیازی بوکێنی لەم گوڵزارەدا دەرکەوێت .. تا ئێستا هەموو گوڵەکان بێ پەساپۆرت بەرەو دوورترین دوورگەی بەختەوەری پەپولەکان ئەفڕن .. تا ئێستا باخەوانێك بۆی نیە گوڵەباغێك بە قاچاغی بفرۆشێتە چایچییەك و بۆنی چایەکەی پێ خۆشکات .. پشیلەیەك حەدی نیە دەست لە گەل مەیموونێکی باخچەی ئاژەڵاندا تێکەڵکات تا بتوانێت مۆز لە عەمبارەکانەوە بەدزی دەرکات و بیفرۆشێتەوە دەرمانخانەی مارەکان ..،

تائێستا نەکراوە شوبهە لە مێشوولەیەك کرابێت لەناو مەخزەنی تۆز و دەرمانەکانی بێستاندا لەسەر دزییەوە دەرکرابێت..، نەبووە دار هەنارێك ڕۆژێك گلەیی لە فەرمانبەری کۆزە سپیندارەکان کردبێت و گووتبێتی ئەو و چنارەکان ڕێککەوتوون سێبەرەکانییان بە گران بفرۆشنەوە هاولاَتییانی باخچە لە کاتی کوژانەوەی مانگدا ..،

نەبووە .. بەهێیەك گلەیی لە مازیی ئەو دۆڵانەوە بكات كە گوایە با كانی هاوین ئەشارنەوە تا نرخی سەهۆڵی دارسێوەكان بەرزبێتەوە ..،

نەخێر لەم مەملەكەتەی ئێمەدا .. كە دوا مەنزڵگەیە بۆ چەوسانەوە و مێژوو .. ئیدی كەس ناتوانیٚ باوەڕ نەكات كە گوڵەكانی بەهەشت لە گوڵەكانی ئێمە جوانترنین ..، كەس ناچێتە ئەقڵییەوە حۆرییەكان .. لە ژنەكانی ئێمەوە خۆشترو ناسكتر و جوانترو بە تامترین ..، ناكرێت باوەرنەكەین كە ئێمە زۆر لەوانە بەختەوەرترین كە ئەچنە بەهەشت ..، ناكرێت هەر كەسێك كە رۆژنامەی كێڵگەكانی گەنم و جۆی ئێمە بخوێنێتەوە .. باوەڕ نەكات ئێمە چەند جوان و .. چەند .. بەزەوق و چەند ئازاد و زیرەكین .. تا ئێستا رووی نەداوە .. بارێك ماچی قاچاغ لە شەوێكدا گیرابێت ..، نەبووە كچەكانی هەنار یان سێوەكان لەسەر فرۆشتنی مەمكەكانیانەوە گیرابن ..، لێرەدا .. تاوانەكان .. كارەساتەكان .. هەتا زریانە تورە و تۆفانە رەشەكان .. لێرەدا خەلاس بوون ..، شەڕەكان لێرەدا كوژانەوە ..، ئێستا لەسەركردە دڵرەقەكانی ئەوسادا .. نەوەیەك پیٚ ئەگات دڵییان لە گولاڵوكی بەهاراندا نەرمترو لەگەل لەرینەوەی گەلاٚكاندا .. بەلادا دێن و شلترین پیاوی دونیان لە بەرامبەر دیمەنە جوانەكاندا .. وەك رووبار و ئاو ئەڕژێنە ناو باخچەكانی جوانی و سۆز .. هەموو شتە ناخۆشەكان لێرەدا بۆ كۆتا خوا حافیزیان لە خواكرد و توانەوە ..، خوا حافیزیان لەزەوی كرد و لەناو گریانی خۆیاندا بوونە هەڵم و وەك پفێك لە هەوادا كەوتنە بۆشایی..

ژنەكەم مەچەكی گرتم و رایتەكاندم .. ئەی پیاوە جوانەكەم .. ئەی پیاوە شیرینەكەم .. ئەی دڵناسكترین پیاوی زەمین .. شۆخترین شاعری باغ .. پیاوە پڕ لەنێرگز و بۆنەكەم .. تژی لە سحر و وەفا .. پیاوەكەم گوێم بدەییٚ .. بەو گوێچكە تەنیایەت .. تەماشامكە بەو چاوە تاقانەت .. بۆنمكە .. كە لووتت

بووه بەیەك كون .. قژم بخەرە ناو ئەو دەستە بێ
پەنجەیەت .. بانگمکە بەو بێ دەنگییەت .. لە گەڵمدا
بنوو بەو قاچە تەنیایەت .. ئەی پیاوەکەم پیاوە
جوانەکەم کە لە نیوەوەڕا بە نیوە بوویت .. تۆ و ئەو
جوانیەت .. سۆراغی کچەکەم .. لەم با یانەوە بۆ بکە
.. کە کڕنۆشت بۆ ئەبەن .. پرسیاری کچەکەم لەو
ڕێبوارانە بکە کە لێت ئەترسێن .. ئەو مەلانە کە لەبەر
سێبەری دارەکانتدا بە کزۆڵەیی هەڵنیشتون و ئەلەرزن
.. پرسیارێك لەو پایزەی ئەنیەت بکە .. پرسیارێك
لەو کۆترە بێدەنگانە .. بە چاوە تاقانە و پڕ ناز و
لەخۆباییەکەم .. پێمگووت .. ئەی ژنی جوان ..
لێمگەڕێ ئیدی نێرگزەکان لەناو مندا شین نابنەوە ..
هەنارەکان لەناو مندا ناڕوێنەوە .. گمینەکان ..
دەنگی کەنارییەکان ناگەنەوە گوێچکەکانی من .. من
تەماشام بۆ ئەو باخانە جارێکی تر ناجووڵێتەوە ..

من ئێستاکە پیاوێکم .. پڕ لە هەتاوی غەریبی ..
ئێستا هەموو خەلیاقەتەکان غەریبن لەمن .. هەموو
ئافەریدەکان نامۆن بە ڕوانینەکانی من و گۆشتی من و
بۆنی من و سەرنجەکانم .. بڕۆ تۆ غەریبترین ژنی ..
کە ئەشزانم ژنی منیت ..، من کەناری و باخچە و
پەپوولەکانی خۆشم ناناسمەوە .. بیرم ئەچێت ..
من ڕۆژێك هەیوانێکم دروستکردبێت .. تەنیا بۆ
ئەوەی پاسارییەکان تیایدا بفڕن .. بیرم ئەچێت من
کۆشکێکم لە ڕێحان چێکردبێت بۆ ئەوەی
پەپوولەکان بێن لەوێ خەنە لە پرچ و پەرچەم و
دەستی خۆیان بدەن .. بیرم ئەچێت ئاسۆیەکم بە
نیسانۆك و پەمبەیی کوریکەی خۆخەکانەوە ڕەنگ
کردبێت تا کۆترە کێوییەکان بێن تیایدا لانە بکەن ..
بیرم ئەچێت من باخێکم کردە جیازی بوکێنی
کەنارییەکی تاقانە .. بیرم ئەچێت من ڕێی دەریاییەکم
گۆڕی تا ماڵی قومرییەك خراب نەکەم .. بیرم ئەچێت
پایز چیدی ئەڵێت .. گۆرانیبێژەکە چەندیدی هاوار
ئەکات و .. ئەم ڕووباری خوێنەش ئەگاتە کوێ و ..
مناڵە چەتوونەکەش چی بەسەردێت ..؟ ئەکوژرێت

یان لە دواکۆلانەکانی مردندا ئەتوانێت بچێتە دەر ..؟ ئەتوانێت خۆی بازداتە .. باغێك پڕ لە پرسیار و گومان .. نزانم .. من بیرم ئەچێت ئەو چاو جوانە بیژمۆتە .. ئەگەر بێت و دەستی بگاتە هەناری ئەو گومانانەوە .. ئەبێت پێشبینی کارەساتی گەورەبکەین ..! ئەگەر دەستی بگاتە سێوەکانی ئەو پرسیارانە .. ئەبێت وێنای زریانی عەنتیکە بکەین .. ئەم منداڵە .. هەم زیرەکە و هەم تورە .. هەم نامۆیە و هەم شارەزا .. هەم تیَ ئەگاو هەم بزر .. ئەو لە دەروازەیەکەوە هاتۆتە ژیان .. کەم کەس لەو دەروازەیەدا بەرئەبێتەوە .. ئەو لە پەنجەرەیەکەوە فڕیوەتە ئەم باغە .. کەم کەس لەو پەنجەرەیەدا .. ئەفڕێت ..، ئەوەی لەو دەروازە و پەنجەرەیەشدا بەربێتەوە و بفڕیَ .. یان شێت ئەبێت یان ئەبێتە فەیلەسوفێکی سەر سەخت ، یان ئەمرێت .. یان ئەبێتە لاسارترین پیاو و کوشتەترین ئافەریدە .. یان ئەبێتە شلترین مرۆڤ .. یان پیاوی لافاو ..

ئەم پەنجەرەیە پڕە لە جادوو .. کەس نزانێت ئەم مناڵە چ جادووێکی خستۆتە باخەڵییەوە .. بۆیە هەموو شتەکان مەراق ئەکات .. ئەتوانێت هەندێجار گوڵ محەمەدییەکان وەك هەنارێکی دەوبەش واق وڕماو بکات بە حیکایەتە سەیر و سەمەرەکانی ..، ئەتوانێت پشیلەکان ڕەپ بکات .. بە خەیاڵ و ئەندێشە سامناکەکانی ..، ئەتوانێت کسۆکەکان بتۆقێنێت .. بە گێڕانەوی بەسەرهاتی گورگێك لە سەفەریدا بۆ وڵاتی کەمتیارەکان ..، ئەو کوڕە مەلعونە .. تەماشایەك لە چاوانی هەیە وەکو تەماشای تاوانکارەکان .. ئەو کوڕە بەد بەختە .. گومانێك لە قسەکانی هەیە وەکو گومانی فەیلەسوفەکان .. ئەو کوڕە جوانە .. بیژایەتییەك لە جوڵەکانی هەیە وەکو بیژایەتی ڕێوییەکان .. ئەو لە هەندیَ ساتدا لەوە ئەچێت فێڵبازترین کوڕی ئەم زەمینە وەیشوومەیە بێت .. لە هەندیَ کاتیشدا لەوە ئەچێت گوناهترین منداڵی مێژوو بێت .. ئەو ئەتوانێت شتە دوور و

**نزیکەکان .. وێکچوو و هاودژەکان لە خۆیدا کۆبکاتەوە .. بۆیە لە کوڕی ئەفسانەو ئەو چیرۆکانە ئەچێت کە کەس ناتوانێت پێشبینی قسە و رووداو و چالاکییەکانیان بکات ..**

**ئەو کە بە سەلامەتی لەو دەروازەیەدا پەڕیوەتەوە .. رەنگە کوڕی یەکێك بووبێت .. فاڵگرەوە بووبێت ..، یان نووشتە نووسێکی مەعلان و شارەزای فێڵی ئافەریدەکان بووبێت و هەموو شتەکانی بەر لە کوشتنیدا بەو منداڵەی گوتبێت .. یان کێ ئەڵێ .. رەنگە رووداوەکە هەمووی بەشێك بێت لە فێڵەکانی ئەو .. لەو درۆیانەی زۆر بە مەحکەمی ئەیانچنێ .. رەنگە .. ئەم بیژییە لە ماڵەوە هەڵاتبێت .. هەر بۆیەشە لەهیچ کوچەو کۆڵانێکی نووسەرە پیرەکەدا نەگیرسایەوە .. رەنگە هەر بویەشە باوەڕی بەکەسەوە نەبێت . هەر بۆیەشە نەبێتە هاوڕێی مناڵەکان .. ئەو مناڵە لە لوغزیك ئەچێت .. کە خەریکە ئەویشم لەبیر ئەچێت ..**

**من تەواو ژنەکەم .. من تەواو .. نامەوێ چیدی لەگەل مندا راکشێیت .. من ئێستاکە بەو نیوەیەی خۆمەوە .. لەو کاتەی تۆ سۆراغی کچەکەت ئەکرد .. من دەستێکم لە پڕ ون بوو و رۆیشت .. بۆ کوێ نزانم .. لێ زۆر پێیەوە ئاسوودە بووم .. لەو کاتەی کە کچەکە بەسەرهاتی کوشتنی خۆی بۆ گۆرانیبێژەکە ئەگێڕایەوە من قاچێکم پەڕی و بزربوو .. بۆ کوێ رۆیشت نزانم ..؟ من ئێستاکە لەگەل خۆمدا نیوەیەکم ..هەست ئەکەم .. لەجاران تەواوتر و پتەوترم .. لێ نزانم شتەکان هەر هەموو شتەکان بە ئاوسی دێنە پێش چاوە تەنیاکەم .. هەورەکان ئاوسن بە رەنگی باران و بەفرێکی عەجیب .. بەفرێك کە قەت بەو رەنگ و شکڵەوە نەڕژاوەتە ئەم هەوارە .. باخەکان ئاوسن بە دەنگی سەیرو سەمەرە .. کە هەرگیز ئەم دەنگانە لەو هەوارگانەدا کەفیان نەکردووە .. من هەست ئەکەم خۆم بەو لەشە نەشمیلەیەم ئاوسم بە هەستێکی غەریب .. غەریبتر لە گۆرانییەکانی بەبەغا**

.. سەیرتر لە مەکرەکانی کەناری .. عەنتیکەتر لە بەسەرهاتی شەیتان .. شعورێك وەك خوێن و ئارەقە لەبن چەرممدا کەف ئەکات و بەجەستەمدا وەکو ئەوەی بەشەقامەکانی رۆحمدا پیاسە بکات .. ئاوا ئەسوورێتەوە .. وەکو ئەوەی دەنگە هێلێك بێت و لەناو چایدانی گەرمی چاوەکەمدا بتوێتەوە .. وەك ئەوەی قەندە شەکرێك بێت و لەناو زارمدا ببیٚ بە تف ...

ئەم شعورە بەرەو لایەکم ئەبات .. کە نزانم تاوانکارییە .. یان پاکبوونەوە .. نزانم کا ئەم رێگەیە ئەچێتەوە سەر گوڵە حاجییەکان .. یان ژاڵەکانی مردن .. ئەچێتەوە بەر بارانەکانی ئاسوودەگی یان زریانەکانی کوشتن .. نزانم بەو رێیەدا ئەچمەوە سەر شەڕگەکان .. یان خەونێکی سەوز .. ئەچمەوە حیکایەتێکی نەمری .. یان ئەفسانەی دۆڕان و بۆ هەتا هەتایە ...

نزانم ئەم مەفرەقە بوکوێم ئەبات ..؟ بۆ باوەشی سۆزانییەك کە تا ئەبەد تیایدا بگرییێم .. یان باوەشی فریشتەیەك بۆ کۆتا هەر نەسیحەتی تۆبەبوونم لێبکات .. ئەچمەوە بەیارەکانی عەشق و لەوێدا ئەمرم .. یان لە کێڵگە مین رێژکراوەکانی شەڕەف و ناموسدا ئەبمە جەلادێکی تفەنگ بەدەست و لە پاسارییە قەحپە و گوڵە سۆزانییەکانی پاك ئەکەمەوە .. نزانم ئەبمە پاسەوانی ئەم گەلاٚ عاشقانە .. یان زەعیمی ئەو تیمەی بڕیار ئەدات باخچەکان و شەقامەکان و کێڵگەکان پاك کاتەوە لە سۆزانی و بیٚ حەیاکان .. ئێستا لای من ژیان لەوێوە دەست پیٚ ئەکات .. لە باخە رووسوورو شەرمنەکانەوە .. کە گوڵەکانی بۆ ئەو دیوی باخچەکان نوێژ ئەکەن و پاسارییەکانی بۆ نادیاریی هەتاو رۆژو ئەگرن .. ژیان لەوێوە دەست پیٚ ئەکات کە حورمەت بۆ کۆتاییەکان زیاترە لە سەرەتاکان .. هی وتراوەکان لە نەوتراوەکان .. ژیان لەوێوە روونە وەك لەپی دەست .. ئاسانە وەکو

فڕکردنی ئاوێکی تەزی .. ژیان لەوێوە بەرهەم دێت .. کە هەموو شتەکان سادە و ساکار و بە سێبووری بن .. من تەواو نامەوێ وشیاری خۆم بە هاوکێشەکانی گومانی ئەو بێ باوەڕ و شەکاکانەوە لەدەست بدەم .. با ئەم کوفر و مەراقانە ڕێنماییم نەکەن .. بەرەو مەنفاکانی ماناو .. ماناکانی مەنفا .. بەرەو کردەکانی وتن و وتنی کردەکان .. بەرەو نامۆییەکانی زمان و زمانی نامۆییەکان .. من هەرگیز نامەوێ وەکو ئەو گومانانە .. وەکو مار درێژبمەوە ناو مێرگە خوێناوییەکانی مێژوو و فێڵەکانی سیاسەت ..

من ماندووم .. ئەی ژنە جوانەکەم .. من ماندووم .. ماندووم لە مەکتەبی حەقیقەت و لە وانەکانی ئاسوودەگی و ناموسەوە کەوتووم .. بە باغێك ئاخ و زامەوە نمرەکانی سەر کەوتنم لە حساباتی غەدر و خیانەتەکاندا پێ کۆ ناکرێتەوە .. من بیرم ئەچێت لە وانەکانی ژندا .. فێرە چ بووم .. فێری عەشق .. یان خۆ کوشتن .. فێری خۆشەویستی یان فێڵەکان ... فێری دڵداری یان زیزبوون ..، فێری ئەڤین یان شەڕ .. نزانم لەگەل ژندا بوومە برادەری فریشتەکان .. یان دوژمن .. بوومە ئەویینداری شەنگەبییەکان یان ڕەفیقی گورگێکی ئەفیونخۆر .. نزانم لەگەل ژندا فێربووم گوێ لە شیعر بگرم .. یان تەهدیدەکانی هەورێکی ڕەش ..، فێربووم بچمە ژوانی وشەکان .. یان مەوعدی ڕەشی قومارچییەکان ..، فێربووم لەگەل گیاکان پیاسە بکەم یان خۆم بخەمە ڕووباری حەرامەوە ..، فێربووم بچمە هاواری سێپەڕەکان لە بەیانیدا یان کوژانەوەی کوریکە سپییەکانی گەراز ..، نزانم بیرم ئەچێت دواجار کەینێ بوو ژنەکەم ماچ کرد .. کەینێ بوو کچەکەم کردە باوەشم و دەنگی ریکۆردەرەکەی بڵند کرد .. ڕەنگە زەمەنێکی زۆر درێژ بێت ئەوەندەی حەقایەتەکان دوور بێت .. هەندەی زەمەنی شەڕەکانی رم و تیرەوە دوور بێت .. بیرم ئەچێت کەینێ بوو .. دوا جار تامم لە گۆرانی و گەرازی باخەکانی ئاوازەوە کرد ..، کەینی بوو دوا

جار بە بینینی پیشانگای ئەم سنەوبەرە شێوەکارانەوە تەماشام سازبوو ..، کەینێ بوو دوا جار چوومە شایی کاژێکی برادەر ..، کەینی دواجار لەگەڵ نێرگزێك شعرێکمان چاککرد ..، کەینی لەگەڵ وەنەوشەیەك حەقیقەتێکمان لە کانییەکدا وەك گەوهەردیتەوە ..، کەینێ بوو دواجار گۆرانییەکانمان لەگەڵ پاساری و گورگەکانەوە گووت ..، کەینێ بوو لەگەڵ سەگێکدا چووینە ماڵی مام ڕێوی و ئەویش باسی موغامەرەکانی جەهەنەمی بۆ ئەکردین ..، بیرم چوو کەینێ بوو دواجار بە ژیانم گووت .. چەند جوانیت؟ بە مرۆڤم گووت چەند گەورەیت ..؟ بە باخچەم گووت چەند تەڕیت .. بە چیام گووت .. چەند ئیحا بەخشیت ..؟ بە رووبارم گووت قوربانت بم .. بە هەورەکانم گووت .. سەفەرتان خۆش .. بە نێرگزەکان هەی ئافەرین .. بەچنارەکان سێبەرتان کەم نەبێت ..، کەینی بوو دواجار لە خەمی بییەکاندا چوومە باخەکانی گوڵەباغ و پرسیاری بۆنخۆشترین

دکتۆرم کرد ..؟ کەینێ بوو لە رووباردا پرسیاری ساردترین تنۆکم کرد بۆ گوڵ کنێرێکی نەخۆش ..؟ کەینێ بوو .. جوانترین ڕێحانم لەگەڵ شۆخترین شلێردا تەعاروف پێکرد ..؟ بیرم نایەت کۆتایی شتە جوانەکان کەینێ بوو .. بیرم چوو .. بیرم ئەچێت .. ئێستا نزانم من ماندووم یان ئاسوودە .. شەکەتم یان بەهێز .. خۆشمەوێی یان رقم لێتە .. من خەریکە بزر ئەبم لە ڕێحانەکان .. لە کۆترەکان .. لە ژنەکان .. لە گۆرانیبێژ و مناڵەکان .. خەریکە تاقە چاوەکەم کز ئەبێت و خەواڵو ئەبێت .. خەریکە کونە لووتە تەنیاکەم ئەگیرێت و بۆن ناکات .. بۆن بە گوڵی هەقیقەتێکەوە .. بە دنکی مەرگێکەوە ..خەریکە پێیەکەم نزانێت لەسەر چی وەستاوە .. ئاگر یان ئاو .. پشکۆ یان خۆڵەمێش .. بیرم نایەت .. لە ماڵم یان لە باخچە .. لە هەیوانەکەم یان لە شانۆ .. لەسەر چی دانیشتوم .. کورسی و مێزە پلاستیکییە کە ..؟ خەون بوو یان خەیاڵ چیرۆکی پاییزە توڕەکە .. توڕەبوو یان

من هەردەم حەزم لە پیاسەی ئێوارانە و ژنەکەم بوو .. کەینێ ئاوا کەوتمە بۆشایی .. من هەرجار حەزم بە بەزمی منالأن و شاعیرەکانەوە خۆش بوو .. کەینێ کەوتمە ئەو کەند و لەندانەی بێکاری فکریدا ..؟ ئێستا من لە کوێوە بەرەو سەرەتاکان بڕۆمەوە .. لە کوێوەش تەماشای کۆتاییەکان بکەم ..؟ من نزانم لە چ شوێنێکی ئاسێ .. یان قایم وەستام کە کەس نامبینێت و تێم ناگات و .. وا بزرو بێ سەر و شوێنم ..؟

وا ئەزانم شتەکانم لە زاکیرەدا ڕەش ئەبنەوە .. چۆن بە کلیکێك زاکیرەی کۆمپیوتەرێك سفر ئەبێت .. وا ئەزانم دەماغی منیش ئاوا مەسح ئەبێت .. کەچی ڕەشیش نابنەوە .. دەنگێك لە بنگوێم بە چپە پێم ئەڵێت .. شتەکانت بیر ئەچنەوە .. کەچی ناشچن .. خەریکە .. بەرەو شێتبوون ئەڕۆم .. وەك چۆن پارچەکانی جەستەم ڕۆیشتن ..،

دڵشاد .. نزانم خەریکە شتەکان بزر ئەبن .. وردەوردە گوێچکە تاقانەکەم گرانتر ئەبێت و گوێبیستی دەنگەکان نابم .. شتەکان لە پێستمەوە بێ هەست ئەکەونەوە .. ئێستا من نزانم کەیف خۆشم یان بگریم ..؟

بڕۆم یان بوەستم .؟ بنووم .. یان بمرم ..؟ بچمە باخچەکان .. یان سۆراغی کچەکەم ..؟ نزانم مەفروزە پیاوێکی وەکو من لەم ئانوساتەدا چ بکات..؟ شۆڕش .. یان ئاشتی ؟ یاخی بێت یان تەسلیم ..؟ شتەکان کەینێ وایان لێهات ..؟ کەینێ ئاوا تێکەڵ و پێکەڵ و سەراسیمە بوون .. کەینێ ئەم خەیاڵأتە .. بوو بە فەوزا ..؟ کەینێ ئەم فەوزایە بوو بە سیستەم ..؟ کەینێ لێدانی دڵی من وەك ئەمێستا شێواو بووە .. کەینێ خوێنم ئاوا بەناو دەمارەکانمدا بەسەرگەشتەییدا سوڕاوەتەوە ..؟ کەینێ من خوێن و کێم ڕشاومەتەوە ..؟ من هەمیشە شەیدای دەنگی ئەو گۆرانیبێژە بووم .. کەینێ وا لەبەر چاوم کەوت ..؟

کوان ئەوان چیان بەسەر هات و بۆ کوێ ڕۆیشتن .. چوون لە کارەساتێك بگەڕێن .. یان وەیشوومەیەك بگرنەوە .. چوون تاوانێك بکەن .. یان باخێك ببڕنەوە .. چوون جۆگەلەی عەشقێك بگرنەوە .. یان ڕەزێکی سۆز وشك کەن ..؟ نزانم .. چیم بەسەر دێت لەم بیابانی فەراغەدا .. لەم پێدەشتەی کە مانای تیادا ئەبێتە سفر .. کەهەقیقەتی تێدا ئەبێتە ڕەشۆڵەیەکی کوژراو و چاو لەسەری ناوەستێت ..، چیم بەسەر دێت لەم گوڵزارە بێ ڕەنگەدا .. لە بۆشایی ڕەنگەکاندا ڕاستییەکان هێندە کاڵ ئەبنەوە کە نابینرێن ئەبنە برینێك پەنچە ناتوانێت دەستیان لێبدات .. من ئێستا پیاوێکی تەنیام .. نیو پیاوێکی تەنیام .. بێ پەنچە و بێ زەوق .. بێ دەنگ و گوێیەکی کز و گونێك و قاچێکم هەیە .. ئەوە چ شەڕێکە .. لەناو مندا خۆی ماتداوە .. چ بورکانێکی توڕەیە لەناو دەماغمدا خەریتە بۆ وێرانکردنی شارێك دروست ئەکات .. ئەوە چ فێڵێکە .. نامووسم لە جوانی و عەشق ئەیکات ..؟

خەریکە ئەبمە پیاوێك لە پیاوانی ئەشکەوت .. ڕەبەنێکی سەرسەخت لە بەرامبەر حەزەکانی جەستەوە و بەزمەکانی گۆشت ..، خەریکە ئەبمە مەخلوقێك لە تەقوا بۆ هێزە نادیارەکانی ئەودیوی باخ و جارە گوڵەکان ..، ئەو دیوی هێلەکانی فکر و پنتەکانی بیرکردنەوە .. دڵم کە بۆتە نیوە و خوێنێك فڕێ ئەداتە چاوەکەم پڕیەتی لە ڕق و حەزی کوشتن .. غەرقە لە کەفی وێرانکردن و لەناوبردن .. تژیە لە کوڵی بڕینەوە و سڕینەوە .. ختمە لە کوێرەوەری و بەدبەختی .. نگووم بووە لە جەهالەت و تاریکی .. دڵم .. دەمارەکانی بەو فتنانەوە شل ئەبنەوە کە زریانەکان بەریئەدەنەوە گیانی مێروولەیەك ..، بەو کوشتنانەوە خاو ئەبنەوە کە تاقمێك بازی چەکدار لە گەل کۆترێکی ئەسیردا ئەنجامی ئەدەن .. بەو تاوانانەوە ئاو ئەخواتەوە کە گورگەکان بەڕۆژی

رووناك له باخچه تاریكه‌كاندا ده‌رهه‌ق به ئاسكه چاوجوانه‌كان ئه‌نجامی ئه‌ده‌ن .. ئیدی مه‌ودای تاوانه‌كان چه‌ند گه‌وره‌بن .. ده‌ماره‌كانی ئه‌م دڵه كوشنده‌یه‌ش ره‌پتر و ره‌قتر ئه‌بێت ..،

خوا عالیمه .. خوێنێك له چاوه‌كه‌م فیچقه ئه‌كات .. كه هه‌ر ته‌نیا ئه‌گه‌ر ژنه‌كه‌م بتوانێت وه‌سفی بكات .. مه‌گه‌ر ته‌نیا ژنه‌كه‌م بتوانێت بۆ یادگار له ده‌فته‌ره خاڵداره‌كانی رێواسێك بینووسێته‌وه و مه‌گه‌ر بتوانێت به په‌ڕی كلكی تاوسێكه‌وه له‌سه‌ر شیفۆنی په‌ڕی په‌پووله‌یه‌كه‌وه ره‌سمی كات..،

ئه‌ی پیاوه‌كه ..، ئه‌ی خوایه گیان .. ئه‌وه چ تاریكییه‌كه له ئه‌نییه‌ی ئه‌و پیاوه‌وه ئه‌ڕژێت .. ئه‌وه چ زریانێكه له‌ناو پرچی ئه‌م پیاوه‌دا ده‌ردێت .. ئه‌و چ فه‌وزایه كه له ده‌ماغی ئه‌و پیاوه‌دا وه‌ك تۆفان و وه‌ك بوركان هه‌ڵئه‌كات .. ئه‌وه چ جه‌نگه‌ڵێكی بریندار و دڕو هاره له چاوه‌كه‌یدا .. ده‌رئه‌پۆقێت ..؟!

ئه‌وه چ شه‌ڕێكه له گۆناكانییه‌وه دێت و به‌ر ئه‌بێته ئه‌م گیانانه‌وه .. ئه‌وه چ مه‌فره‌زه‌یه‌كی بێره‌حمی پڵنگه خوانه‌ناس و پێغه‌مبه‌ر نه‌ناس و مرۆڤ نه‌ناس و وشه نه‌ناسه .. ئاوا به‌رئه‌بنه ئه‌م خاكه به‌سته‌زمانه .. ئه‌م كێڵگه‌ی گوڵه به‌ڕۆژه ناسكانه ..؟ ئینجانه نازنازه‌كان ئه‌شكێنن .. گوڵدانی مێلاقه‌كان خاش ئه‌كه‌ن .. ئه‌وه چ مه‌فره‌زه‌یه‌كه .. پیاوه‌كه .. تۆ سه‌ركرده‌یانیت .. ئه‌وه چ مه‌فره‌زه‌یه‌كه هه‌ر یه‌كه‌ی باغێك خشخاشی له‌زار ناوه .. رووبارێك ئه‌فیون ئه‌خواته‌وه .. وڵاتێك مه‌ی له چاوانیدا بار ئه‌كات .. ئه‌وه چیه خودایه گیان .. ئه‌وه چ خاكێكه ئێمه له‌سه‌ری وه‌ستاوین .. دوورگه قوڵه‌كانی جه‌هه‌نمن .. یان خاكه به‌دفه‌ڕه‌كانی مه‌نفابوون ..؟ ئه‌مه چ ئاسمانێكه له ژێردا ئه‌ناڵێنین .. هه‌وارگه‌ی دڕنده‌ترین وه‌رز .. وه‌رزێك كه فشه‌ی به تۆفانه‌كانی زستان و گه‌رماكانی ته‌مموز و زریانه‌كانی پایز دێت ..؟ وه‌رزێك كه گاڵته‌ی به بوركانه‌كانی خاك و ره‌شه‌باكانی

ئاسمان و فتنەکانی خواوە دێت ..؟ ئەمە چ غەزەبێکە مێردەکەم سەرخۆش ئەکات بە کوشتن و کاولکردن .. چ وەیشوومەیەکە مێردەکەم ئەکا بەسەرسەختترین خوێنداری حیکمەت ..؟ چ هاوارێکە .. مێردەکەم ئەکا بە دوژمنی حەقیقەت ..؟ چ بەڵایەکە مێردەکەم ئەکاتە باوەکوشتەی ئازادی ؟

چ بەڵایەکە .. چ فەرتەنەیەکە .. چ قەزییەکە چ خورافەتێکە .. چ خوایەکە .. دەستی مێردەکەم .. ئەخاتە خوێنی کچەکەمەوە .. ئەی خوایە گیان .. ئەوە چ ئافاتێکە .. چ کارەساتێکە .. چ موسیبەتێکە .. چ......

من نزانم .. تۆ باسی کێ ئەکەیت و باسی چی ئەکەیت .. من تەواو هەموو شتەکانم لە بیر چوونەوە .. تەنیا ئەوەم لەبیر نەچووە .. کە شتەکانم بیرچوونەوە .. من نیوەیەك دەستی گرتم و نیوەیەك بزری کردم .. کچی خاوەن دەلاقە پڕ خەونەکە هات و پێی گووتم .. ئەی کابرا چەند لە بابە گیانی من ئەچیت .. بابەی دڵرەق و بابەی خۆشەویستی و ئازار .. تۆش تەواو وەکو باوکم لەناو خوێنی لینجی ئەو رووباری خوێنەدا کە بەرەو ماڵی خوا رێ ئەکات .. چاوەرێی کچەکەت مەکە .. کچەکەت کە هەر لەخۆم ئەچێت .. ئەو سەدەیەکی دیکەی ئەوێت تا هەڵسێتەوە و نێرگز لە چاوەکانیدا شین بن .. رێحان لە پرچەکانی بڕوێت .. کوریکە هەنار لە لێوەکانی .. هەلاڵە لە گەردەنی .. گوڵاڵە لە نێوان مەمکە گچەکانی کە هێشتا کەس دەستی لێ نەداون .. لە جێی دڵیشیدا هێلانەیەك بۆ کۆترە عاشق و هەموو مەلە خۆشەویست و ئەزیزەکانی یەکدی دروست ئەبێت .. شانەکانی ئەبنە جوانترین و خۆشترین جێژوانی هەموو خەلیاقەتە عاشقەکان .. ئەی ئەو باوکەی لە باوکی من ئەچیت .. کتومت ئەویت .. ئەویش نیوەی خۆی بزر کردوو .. نیوەی کەشی بردیە فەوزا .. نیوەیەك حیکمەتی پێ نەهێشت .. نیوەکەی کەش ختمی کردە تاریکی .. ئەی ئەو باوکەی وەکو باوکی

من .. غەزەبترین .. ئافاتترین .. کارەساتترین باوك .. بڕۆ تا سەدەیەکی دیکە چاوەڕێی کچەکەت مەکە هەڵسێتەوە و لەگەل ئەو رووباری خوێنەدا ریٚ بکات بە ماڵی خوادا .. چاوەڕیٚ مەبە .. تا داوای لێبوردنی لیٚ بکەیت .. ئیدی ئەو پێویستی بە لێبوردنی تۆ نیە لێگەڕیٚ .. با سەدەیەك لەناو ئەو خوێنەدا هزرکات .. حیکمەتێك لە کوشتنەکەیدا بەدیکات .. لێگەڕیٚ با لە کوشتنەکەی حەقیقەتێك کەشفکات .. راستییەك ئاشکراکات .. فێربێت و بزانێت مرۆڤ .. لە چ غەریبستانێکی کوشندەدایە و لە چ وێرانەیەکی گەورەدا ژیان بیٚ حیکمەت .. بیٚ شەڕەفانە ئەدۆڕێنیٚ .. با تێبگات .. مرۆڤ چ لەندەهوڕێکە بۆ خۆی و چ گێلیك و چ عەبەسێکیشە لە جوود ..

تەنیا ئەوەم لەبیر ما .. نیوەکەی دیکە کە رۆیشتبوو .. هاتەوە و لەگەل نیوەکەی دیمدا یەکی گرتەوە .. و وەکو جاری جاران .. پێش ئەم فەوزایە .. پێش ئەوەی ژنەکەم کە چوو کچەکەم بخەوێنێت ..

پێش بەسەرهاتی پایز و ئەو شتانەی دی کە بیرم نەماون .. دوای سەرەتاکان ، پێش کۆتاکان .. لە دەرەوەی زەمەن و جێگەکان .. نیوەکانم کە منیان تەواوکردەوە .. نیوەیەکم کەبیٚ دەسهەلأت و نیوەیەکم جەلاد بوو .. کە هەردووکیان پێکەوە پێیان گووتم .. تۆ شەریفیت ناموسی تۆ لە پەڕی گوڵەکانی بەرباران پاکترە .. شەڕەفی تۆ .. لە ئاسمانی شین و ساماڵ بێگەردترە .. ئەی پیاوی شەریف .. لەناو باخەکاندا سەربەرز بڕۆ.. سەربڵند تەماشای مەلەکان بکە ..، دەنگت با سەر دەنگی هەموو قومرییەکان بکەوێت .. رەنگت با لە هەموو شێوەکان جوانتر بێت ..، ئەی پیاوی شەریف .. تۆ دڵێکت هەیە وەك دڵی سەرکردەکان ..، تۆ جەرگێکت هەیە وەك جەنگاوەرە سەر رەقەکان ..، دەست و پەنجەکانی تۆ .. لەدەست و پەنجەی پیاوە رەشیدەکانەوە ئەچن .. سۆماکانت دوو کریستالی رقێکن .. کە تەنیا لە چاوی پیاو کوژە بە هەیبەتەکانەوە بریسکە ئەدەن ..

بەدەیان دەنگ لەناو مێشك و دەماغمدا .. ئەهاتن و ئەچوون .. زیڕەی ژنەکەم لە هەموویان بڵندتر بوو .. هەندێ شتی ئەووت .. بەڵام تێی نەئەگەیشتم چی ئەووت .. ئەگریا..، لێ نەمئەزانی بۆچی ئەگریێ .. خەمێ لەچی ئەخوارد .. قەهری چیبوو .. بەچ ئازارێك و برینێکەوە ئەتلایەوە .. گووتم ئەویش ژنێکە بێ حەیاو گێل ..،

چەند پێم گووتی ئەی پیاوەکە .. پەنجەکانت .. چاوەکەت .. کچەکەت .. کچەکەت .. کچەکەت .. چەند هاوارم کرد .. دەنگت .. ڕەنگت .. حیکمەتت ..، چەند بانگم کردی و نەگەڕایتەوە .. چەند پێم گووتی سۆراخی کچەکەم بکە .. سۆراخی پەنجەو چاو و کچەکەت بکە ..، ئەی پیاوەکە .. تۆ کەینێ وابوویت .. بوویتە لافاوی ڕق و .. دروشمی شەڕ و خوای فەنابوون ......

ئەی پیاوەکە .. ئەی خوای گچکۆکەی مردن .. تەماشاکە .. بەچ دەستوورێکی کوێرەوە حوکم ئەکەیت .. بەچ شمشێرێکی ژەنگییەوە وانەکان ئەڵێیتەوە .. بە چ تاریکییەکەوە ئەچیتە ژوورەکانی عەشق .. بزانە لە چ موسیبەتێکدا وردت کردمەوە .. چیت بەسەر هێنام .. ئەی سەردارەکەم .. لەپای چی ئەو خوێنڕشتنە .. لەپای چی ئەم کوێربوونەوەیە .. لەپای چی ئەم جەنگە بە فتنەیە .. لەپای چی ئەم هەڵوەرین و خەزانە کوشندەیە .. لەپای چی ئەم رووخانە سامناکە .. لەپای چی .. ئەی بێ شەرەفترین پیاوی زەمین ئەم گۆبەند و بەڵانانەوە .. ئەی بێ حورمەتترین پیاوی ئەم جەنگەڵە .. ئەی ناپاکترین دەستی ئەم قەدەرە .. ئەی تۆفانی تورەهات ئەی مەشئومترین پیاوی ئەم گەڕەکە سەرلێشێواوە .. ئەی نابووتترین .. باخەوانی باخچەکانی ئەم شەڕەفانە .. ئەی کەئیبترین پایزی ئەم وەرزە شوومە .. ئەی گێلترین پەیڤی ئەم دەستنووسە ڕەشە .. ئەی بەدترین بستە خاکی ئەم زەمینە بێ فەڕە .. ئەی ڕەقترین شکۆفەی ئەم دارە

رزیوە .. ئەی نابووتی حەرفەکان .. مایەپووچی دەستەواژە هیچەکان .. حەشیشەی مێشك .. ئەی کۆمیدیترین پاڵەوانی نمایشەکانی تاریکی .. ئەی خێراترین سەیافی گوڵەکانی میهر .. ئەی تاوانکار.. ئەی مێردەکەم .. ئەی مێردەکەم .. ئەی کوشتەی وشەیەك .. کە قەرزاری نیت .. ئەی خەمخۆر و مەجنونی دەستەواژەیەك کە مانایەکت پێ نابەخشێت ..، ئەی بەندی مەنتقێك کە حیکمەتێکت پێشکەش ناکات .. ئەی دیلی ئایەتێك کە لەماناکەی ناگەیت و ناونیشانی ئاسوودەگیت ناداتێ ..، ئەی ئەسیری کلیلێك کە زنجیرەکانت ناکاتەوە ..، ئەی پیاوی ئاسمانێك کە ناتوانی تێیدا بفڕیت .. ئەی مردووی خاکێك کە بستە زەوییەکت ناداتێ .. ئەی شەریفی شەڕەف کە ناموست پێ نابەخشێ .. کە حەیات پێ نابەخشێ .. کە کەرامەتت ناداتێ .. کە سەرفەرازیت بۆ خەلق ناکات .. کە بەختەوەریت ناکاتە باخەڵتەوە .. کە کبریائت نارژێنێتە چاوەکانت .. بخورێکی سەروەریت بۆ داناگیرسێنێت .. چرایەکت بۆ هەڵناکات ..،

ئەی خاوەنی چاوە پیرەکان ..، ئەی پیر و مەغرور خۆت ..، ئەی مەغرورتر لە حکمەت .. لە ئازادی .. لە دڵرەقی .. لەم شەڕەی چاوانی خۆت ..،

ئەی خاوەنی قاچە پیرەکان .. پیرتر لە کەدی ئەم کاژە بە عومرانە و قەدی ئەو سنەوبەرە رزیوانە .. ئەی سەردارەکەم لەپای چی .. کوشتنی ئەم کچە پڕ شکۆفەیەی ئەوین .. ئەم کچە مەفتوونەی خۆشەویستی .. ئەو کچە چاو خاڵدارەی حەز .. ئەوکچە جوانترەی لە پەیامی دینەکان .. شۆختر لە حیکمەتەکانی خودا .. نازدارتر لە فریشتەکانی حەقیقەت .. خومارتر لە باخچەکانی وەفا .. دڵبەرتر لە نیشتیمان .. بە شۆقتر لە هەتاو .. تەڕتر لە باران .. بە ئاونگتر .. بە خوناوتر لە تەڕترین پەیڤی عەشقاوی ..، هەلاڵەتر لە بۆنخۆشترین نەسرینی ئەم جارە گوڵە .. گەشترین واژەی ئەم دەفتەرەی لەزەتە

.. شەوبۆترین ئەستێرەی ئـەم شەوە بۆندارە .. گوڵشەنگترین کـەدی ئـەم شەنگەبییەی جوانییە .. ئەرخەوانیترین چاوی ئەم درەختە مەستە .. خومارترین نیگای فڕین .. نەشمیلترین لەنجە لە پیاسە و سەما ..

پڕسۆزترین چـەهچەهە لـەو ئاهەنگەی خۆشییەدا .. شـۆخانیترین پێکەنین لـەو کەرنەڤاڵـەی بەختەوەرییەدا .. ئای خوایە .. کچەکەم چەند پڕ کچێنی بـوو .. جەستەی .. روحی چـەنـد تێربوو لە شازادەیی .. کچەکەم شازادە بوو شازادە .. ئەی خوای مەرگ.. ئەی خوای گچکەی مەحف بوون .. ئەی پیاوی قاتل .. لەپای چی ئەو شوعلەیەت کوژاندەوە....؟!

تۆش وەك نووسەرە پیرەکە .. کە نەیزانی چی لە خەلیاقەتەکانی خۆی بکات .. هەڵسا هەمووی بـە کوشتدان .. وەك ئەو رۆماننووسە بیٚ پشییە .. نەیزانی چی لە پاڵەوانەکەی بکات .. هەڵسـا ئینتحاری پێکرد .. ئای پیاوە گەورەکان .. چەند بیٚ دەسـت و بـیٚ دەرەتان و بیٚ مـەنفەزن .. چەند بیٚ ئەقل و بیٚ فرسەت و بیٚ سەودان .. هەمیشە شەیدان .. مردن لە کۆتایی باخچەکاندا هەڵگرنەوە .. هەردەم کوشتەی کوشتنێکن لە قسە خەلاٚستان کات .. ئەی پیاوە بیٚ حلولەکانـی هاوکێشە سادەکان ..، ئەی پیاوە بیٚ دەستەکان لە ئاست شەقی یەزدان .. کەستان قفلێکی نیە جگە لەقفڵی مەرگ .. ئەی سەرخۆشەکان بە کوشتن تـا ئەبەد .. پیاوە مـەحکومەکان بە لـەناوبردن تـا ئاخیرەت .. مردن .. کوشتن .. ئاسانترین گەمەی دەست و پەنجەو چاوەکانتانە .. بیٚ مەسرەفترین فکری بەردەسـتتانە .. بـۆ کوشتن پێویسـت ناکات .. مەنتقێك بانگکەن و باغێك پاسـاری کۆبکەنەوە و شوێنێك بە هەتاو و رێحان و کوریکە خۆخـەوە بڕازێنەوە .. پێی ناوێت پـەڕی مەلەکان رەنگکـەن و ئاسـۆکان بنـەخشێنن و نیسانۆکـەکان بێنە سـەر شەقامەکان و لەگـەل

ڕێحانەکاندا ڕستەیەك بنووسن و لە پێشوازی سوڵتانی مردندا هەڵیخەن ..، بانگکردنی مەلی مردن .. بێ مەسرەفترین سەفەرە لەم جەنگەڵەدا ..، گەیشتنی خێراترین ڕێبوارە بە شەمەندەفەری ئەم دەڤەرەدا .. لەبەردەم سوڵتانی مردندا .. زێدەیە .. قەتمەرەکانی جوانی زێدەن .. ئای سوڵتانی مردن .. چەند بێ دەعیە و ساکارە .. چەند چاپووك و چەلەنگ و هەستیارە .. ئای ڕەفیقێکی چەند ئێسك سووکی ئەم پیاوە بێ شەڕەف و ئەشڕەفانەیە ..!!

سوڵتانی مەرگ .. میوانیانە و .. لە گۆڕستانی ئەم نووسەر و ئەشڕافانە .. وەکو میوانێکی زۆر متەوازیع .. زەوییەکانیان درێژترو پانتر ئەکاتەوە .. عەردەکانیان بە لاشەی نەشمیل و چاوکاڵانی دی قەڵەوتر ئەکات ..، سوڵتانی مەرگ ئەی جوانترین میوانی سەر رووی زەمین .. ئەی میهرەبانترین سوڵتانی چەمکەکان .. ئەی نزیکترین جیران لە قەتمەری ئەو پیاوکوژانەوە .. ئەی بە سۆزترین هاوسەر بۆ شمشێری ئەو مرۆڤخۆرانە .. ئەی میوانی ئێسك سووکی هەمیشەیی شەریفەکان .. من تەواو هیچم بیر نەماوە .. دوا وشەی ئەم دیوانەشم بیر نەما .. وا چاوەکانم بەرەو کوژانەوە ئەڕۆن .. گوێچکەکانم بەرەو نەمان .. لووتم ئەفەوتێ .. چەرمم ئەسووتێ .. من لەناو خۆمدا ون ئەبم و هەنگاوەکانم .. پێیەکانم ناناسنەوە .. دەستەکانم تەوقەکانیان بزر ئەکەن .. من تەواو .. ئەی خەلیاقەتەکانی دەوروبەر .. تەواو من ناوی هەمووتانم لەبیر کرد ناوی هەموو وەرزەکانم لێ بزربوون .. دەفتەرەکانی هەست و کتێبەکانی کتێبخانەکەم .. دەف و کەمانچەکان .. ڕووباری خوێنەکە .. نزانم ئەکەومە بۆشایی و هەست ئەکەم هەم گران و هەم بە هەوادا ئەفڕم .. نزانم من بەدەوری زەویدا ئەسووڕێم یان باخەکانن شێتانە بەدەوری مندا خول ئەخۆن .. منم هەڵئەکشێم یان ئاسمانە دێتە خوار .. من روو ئەچم یان زەمینە سەر ئەکەوێت .. ئەوە چ گومانێکە لە کەللەمدا .. یان ڕۆحمدا سەما

ئەکات ... چ پێشبینییەکە بەرەو شێتی پاڵم پێوە ئەنێت .. چ فەوزایەك .. روحی ماندووی من ئەپێچێتەوە .. چی ئەو سەرەم گریَ ئەدات .. کیَ ئەو وێنانەی بە  بەر چاومدا وەکو تارمایی دێن و کوێرم ئەکەن لائەدات .. ئەی ئەمیری وجود .. سوڵتانی جاویدانی .. فەنای نەفس .. مەلەکوتی ئاسمان .. رێحانە و دەسماڵی بەربووەوە لەو ئاسمانە پرتەقاڵییەی لە پێش چاومدا دێن و ئەڕۆن .. ئەو باخە هەڵواسراوانەی لە بەر چاوانمدا .. هەڵئەوەرێن .. دار و درەخت و بێستانەکان لە باوەشی یەزداندا ئەکەونە خوار .. ئای .. نزانم روحم لەگەڵ کیَ و چی خەریکە تەوحید ئەبێت .......

بناڵیَ .. بناڵیَ .. ئەی پیاوی غەریب خۆم .. بناڵیَ لە ساتێکدا ناڵین تاکە واوەیلای رۆحە .. واوەیلای رۆحێکی بریندار .. بریندار و سەرگەردان ..

بناڵیَ .. ئەی رۆحی خاڵی وجود .. بناڵی .. لەناو ئەو ماتەم و تازیەبارییەی گوڵەکان لە باخچەکاندا ئەیگێڕن .. ئەو پرسەیەی فریشتەکان لە ماڵی خوادا بەرپای ئەکەن .. چ فەزاحەتێکە پیسبوونی ئەو رۆحە .. چ موسیبەتێکە نەزیفی ئەو گیانە لەو هەوایەدا .. کە نە موعینیَ دەستی ئەگریَ و نە ئیزرائیل ئەیکوژێت .. بناڵێنە ئەی رۆح بۆ مەرگێکی هەق .. بۆ مردنێك کەباوەڕت پێی بێت و خۆشت بوێت لە ئامێزت بگریَ و دەست لە ململانێی بیت و بۆ ئەبەد چاوەکانت لێك بنێیت ..، بناڵێنە ئەی روح .. کە زانیت دونیا هێندە هیچ و هێندە مایەپووچە .. بناڵێنە ئەی روح کە تۆ نەتوانی وەك سیوەیلێك ، وەك پەنگرێك بگەشێیتەوە و لەگەڵ خۆتدا سووچێك لە سووچەکانی وجود .. تەمەن .. لاپەڕەیەك لە لاپەڕەکانی وەرزێك لە زەمەنەکان رووناك کەیتەوە ..

بناڵێنە ئەی رۆحی ناشاد .. کە نەتوانی نامەیەك لە گوڵ .. لە بۆنی هەلاڵە پڕ کەیت و بینێریتە وێستگەیەك لە وێستگەکانی عەشق و جاویدانی ..،

بناڵە .. ئەی پیاوی پیر .. کە شتەکانت لێ تێکەڵ بوون و .. زوو زوو .. زووتر .. لە گوڵەکان .. لە پەپوولەکان پیر بوویت .. بناڵە ئەی کوشتەی جەرگی خۆت و روحی خۆت و خوێنی خـۆت ..

بناڵە .. بناڵە ..،

بناڵە و بزانە ئەو گۆرانیبێژە چەند تووڕەیە و .. لە ساتێکدا کە تۆ غەرقی پەشیمانیت .. کە تۆ غەرقی گریە و ناڵە و فرمێسکەکانیت .. کە تۆ تەواو بەرەو کوێربوونەوە تا ئەبەد ئەڕۆیت کە تۆ خەلاس تا ئەبەد بێ رەنگ ئەژیت و ئازار ئەخۆیت .. کە تۆ تا ئەبەد .. بێ قسە رێ ئەکەیت و هەر ساتێك دەجار ئەمریت .. تۆ لەو حاڵەتە نابووتەدا .. لەو بارە ئاڵۆزەدا .. کە تا ئەبەد مەحکومی بە جوینی پارچە گۆشتێکی جگەرت و وەك بنێشت لە نێو ددانەکانتدا بیجوویت .. کە مەحکومیت پەنجەت بخەیتە چاوێکی کچەکەتەوە و وەك ئەوەی دەست لە کێمی برینێك بدەیت .. کەتۆ مەحکومی بەوەی تا ئەبەد سەرت بخەیتە ناو رووبارێك لە خوێنی کچەکەت و چاوەڕێ بیت دوای سەدەیەك هەڵسێتەوە و... بڵێیت .. بمبورە ..بمبورە ئەی کچی جوان .. کچی بێگوناه .. بمبورە .. منی پیرو کەنەفتە و پەککەوتە ببورە ..، بمبورە ئـەی هەتاوی کوژراو .. ئـەی ئەستێرەی کوژاوە .. ئەی گوڵی ئەم مەملەکەتە بریندارە .. بمبورە .. بمبورە ..

ئا لەو ساتەدا بێزارەوە .. گۆرانیبێژە تووڕەکە .. بێ دەف و کەمانچەکە .. لە رەشێنەی چاوەکانی دوو پڵنگی رەشی بریندار ئەناڵێنن .. کە بەو حاڵەتە مەیئووسەوە ئەتبینێ .. دێت و بێدەنگ .. کە تۆ سەیری پڵنگە رەشەکانی سۆمای ئەکەیت .. کە ئەو جەنگەڵە تاریکە بەدی ئەکەیت کە ئەو دڵۆپە شیرییەی لە قوڵایی جەنگەڵەکەوە دێت و لە چاوی پڵنگەکانەوە دێنە دەر و وەك سپیترین پنتی زەمین ئەکەونە سەر سنگی کچە شەلاڵی خوێن و ماچەکان .. غەرقی گولە و گولاڵەکان .. لەو ساتەدا

**لەو دەمەدا .. بەو حاڵەدا .. کە تۆ بە حاڵ .. بۆ دوا جار رەنگێکــی سپی ئەبینی بۆ دوا جار دوا رەنگ ئەبینیت ، گۆرانیبیژە تورەکە .. تفت لێئەکات .........**

**تەواو**